# ناوازەیی
# چیرۆکە قورئانییەکان



## چەند سەرنج و وردبوونەوەیەك
## لە چیرۆکەکانی قورئانی پیرۆز

ئامادەکردنی
فەرەیدون ئەحمەد پێنجوێنی






لە بڵاوکراوەکانی
سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی (٥٣)



**فەرەیدون ئەحمەد پێنجوێنی**

- ساڵی ١٩٨١ لەدایکبووە.
- خوێندنی زانکۆیی لە ساڵی ٢٠٠٤
لە سلێمانی تەواو کردووە.
- بڕوانامەی ماستەری لە زمانی عەرەبی لە
زانکۆی سلێمانی ساڵی ٢٠١١ بەدەستهێناوە.
- مامۆستایە لە بەشی زمانی عەرەبی کۆلێجی
زمان - زانکۆی سلێمانی.
- وانەبێژ بووە لە زانکۆی گەشەپێدانی مرۆیی.

# ناوازەیی
# چیرۆکە قورئانییەکان
## چەند سەرنج و وردبوونەوەیەك
## لە چیرۆکەکانی قورئانی پیرۆز

# ناوازەیی چیرۆکە قورئانییەکان

.......................................................

لە بڵاوکراوەکانی سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی
ژمارە (٥٣)

- ئامادەکردنی: فەرەیدون ئەحمەد پێنجوێنی.
- بابەت: ئەدەبی.
- دیزاین: رەوشت محەمەد.
- چاپ: یەکەم ـ ناوەندی رێنوێن.

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە (١٦٨١)ی ساڵی ٢٠١٧ پێدراوە

# ناوازەیی

## چیرۆکە قورئانییەکان

### چەند سەرنج و وردبوونەوەیەك

### لە چیرۆکەکانی قورئانی پیرۆز

ئامادەکردنی

فەرەیدون ئەحمەد پێنجوێنی

٢٠١٧

# ناوەرۆك


سەرەتا ........................................................ ٧

پێشەكی ........................................................ ٩

دەستپێك ........................................................ ١٠

**دەروازەی یەكەم:**

**چەند تیشكێك بۆ سەر تایبە تمەندییەكانی چیرۆكەكانی قورئانی پیرۆز ... ١٣**

بەشی یەكەم: گونجاوی چیرۆكە قورئانییەكان لەگەڵ

مەبەستەكانی هاتنە خوارەوەی قورئاندا ............................ ١٥

بەشی دووەم: هەڵبژاردنی رووداوەكان لەناو چیرۆكدا ..................... ٢٧

بەشی سێهەم: دووبارەكردنەوەی چیرۆك لە قورئاندا ..................... ٤٢

بەشی چوارەم: باسكردنی وردەكاری، یان بە پوختی باسكردن ............. ٦٠

**دەروازەی دووەم:**

**جووڵەکردن بە رووداوو بازدان بەسەر رووداودا لە چیرۆکە قورئانییەکاندا** .. ٨١

بەشی یەکەم: جوڵە و بزاوتی رووداوەکان لە "حیوار" و "گێڕانەوەدا" .... ٨٣

بەشی دووەم: بازدان بە رووداو لەڕێی تێپەڕاندنی کات و شوێنەوە ......... ٩٩

بەشی سێهەم: جۆرەکانی بازدان بە رووداو ........................ ١٢٣

**دەروازەی سێهەم:**

**شاردنەوەی "قسە" و "قسەکەر" و "وشەی (قال)" و** ... ................ ١٤٩

**بەشی یەکەم:** بنیاتی دیمەنی چیرۆکەکان لەنێوان "لابردنی"ی

وشەی (قال) و "دووبارەکردنەوەیدا" ................................. ١٥١

**بەشی دووەم:** شاردنەوەی "قسەکەر" و هێنانی وەسف، وەك گوزارشتکەر . ١٧٥

**بەشی سێهەم:** بەرجەستەکردنی دیمەنە غەیبییەکان لەڕێی شاردنەوەی وشەی (قال) ... ١٨٧

کۆتایی ........................................................ ٢٠٨

# سەرەتا

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

سوپاس و ستایش بۆ پەروەردگاری جیهانیان و درووود و سەلام لەسەر گیانی ئازیز و سەروەرمان محەممەد، وە لەسەر یار و یاوەر و شوێنکەوتووانی تا ڕۆژی دوایی.

گومانی تێدا نییە، چیرۆك پانتاییەکی فراوانی لە قورئانی پیرۆزدا تەنیوە و وەك وتراوە سێیەکی قورئانی پیرۆز بریتییە لە چیرۆك، ئەم چیرۆکانەش چەند جۆرێکن و هەیانە چیرۆکی گەلان و پێغەمبەران و ناودارانی مێژووە، هەشیانە چیرۆکی پێش سات و شوێن (زەمان و مەکان)ن و چیرۆکی ئەو کاراکتەرانەن کە مرۆڤ نایانبینێت، هەندێکی دیکەیان چیرۆکی پەندئامێزن و چەند شێوەیەکی دیکە، کە پشت بەخوا دواتر نموونە بۆ هەریەکەیان دەهێنینەوە.

ئەم نامیلکەیە پێکهاتووە لە ڕوانینێکی جیاواز بۆ ئەو چیرۆکە قورئانییانە و سەرچاوەی سەرەکیی ئەم کتێبە بریتییە لە کتێبێك بەناونیشانی (بدائع الاضمار القصصي في القرآن الكريم)، لە نووسیني (كاظم الظواهري)، کە وەك دەردەکەوێت لە بنچینەدا توێژینەوەیەکی ئەکادیمییە.

کاری ئێمە وەك ئامادەکار، بریتییە لە وەرگرتنی بیرۆکە سەرەکییەکەی بابەتەکە و دارشتنەوەی بە زمانی پاراوی کوردی و

گەیاندنی بە خوێنەران، واتە کارەکە ناچێتە بواری "وەرگێڕان"ـەوە، بەڵکو زیاتر "ئامادەکردن" و داڕشتنەوەی بیرۆکەکانی ئەو کتێبەیە، زۆرتریش جەختمان لەسەر هێنان و شیکردنەوەی نموونەکان کردووە.

سەبارەت بە تەفسیرە کوردییەکەی ئایەتەکان، بە دەستکارییەوە سوودمان لە تەفسیری ئاسانی مامۆستا بورهان محەممەد ئەمین و چەند تەفسیرێکی دیکە وەرگرتووە.

دەبێت ئەوەش لە بیر نەکەم، کە بیرۆکەی سەرەکی بۆ ئامادەکردنی ئەم کتێبە، دەگەڕێتەوە بۆ بەڕێز "ئەندازیار عوسمان"، کە پاش پێشکەشکردنی سیمینارێکمان لە سەنتەری زەهاوی لە ٢٠١٦/٦/٢ و بەخزمەتگەیشتنی و پاشتریش یەکتربینینەوە لە سیمینارێکی دیکەدا، پێشنیازی ئەم کتێبەی بۆکردم تا ئامادەی بکەم و بە زمانی کوردی دایبڕێژمەوە، لەبەرئەوە فەزڵی بەڕێزیان لەم کارەدا دیارە و جێی سوپاسە.

لە کۆتاییدا، لە خوای باڵادەست داواکارم ئەم کارە بچووکەم لێوەربگرێت و بیخاتە ڕیزی خزمەتێکی بچووکی قورئانی پیرۆزەوە.

فەرەیدون ئەحمەد
مامۆستای بەشی زمانی عەرەبی
لە زانکۆی سلێمانی

# پێشەکی

سوپاس و ستایش بۆ خوای پەروەردگار و درووود و سڵاویش لەسەر گیانی سەروەرمان و یارو یاوەرانی.

لە ئێستادا بە زمانی کوردی، چەند تەفسیری قورئان هەیە، ئەوەی بەلای منەوە پێویستە ئەوەیە، کە لەسەر قورئان خۆی بنووسرێت تا خەڵك زیاتر شارەزابن لە قورئان و وەك خواردنی خێرا بە نرخێکی کەم و بە کاتێکی کەم، تێر ببن، لەم بوارەدا، بەندە کتێبی لەخزمەت قورئاندا، لە نەوەدەکاندا نووسیوە، کە دوو سەد و حەفتا هەڵوێستەیە لە خزمەت ئایەتەکانی قورئاندا، لە کتێبەکانی تریشمدا بابەتی قورئانییان تێدایە و هەندێکیشیان تایبەتن بە بواری وردبوونەوە لە قورئان، وەك: دیمەنەکانی قورئان، فراوانیی مانا لە قورئاندا، بەڵێنەکانی قورئان، خۆپاراستنی قورئان لە هەندێ مانا، تازەگەریی قورئان..

بۆخۆم زۆر حەزم لە بواری وردبوونەوەیە لە قورئان و ئەم بابەتەم لە ئینتەرنێتەوە دەستکەوت و پێشنیازم کرد بۆ برای بەرێزم مامۆستا فەرەیدون، وا سوپاس بۆ خوا تەواوی کرد، هیوادارم کە جەنابیان و مامۆستایانی بواری زمانی عەرەبی هاوشێوەی ئەو کارە، کاری ترمان بۆ بکەن و کتێبخانەی کوردیی دەوڵەمەند بکەن.

ئاشکرایە کە موعجیزە قورئانییەکان تەواو نابێن و بەردەوام شتی نوێ دەردەکەوێت، کە ئەوەش پەیمانی خوایە: ﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْـَٔافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ۗ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿٥٣﴾ ﴾ (فصلت: ٥٣).

جا هەرچەند خزمەتی قورئان بکەین، کە دوا پەیامی خواییە، هێشتا هەر کەمە، چونکە قورئان هیدایەتدەرە بۆ راسترین و تەواوترین رێگا: ﴿ إِنَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ يَهْدِى لِلَّتِى هِىَ أَقْوَمُ وَيُبَشِّرُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا كَبِيرًا ﴿٩﴾ ﴾ و مایەی سەرفرازیی دونیا و قیامەتمانە.

خزمەتکارێکی بچووکی قورئان

ئەندازیار عوسمان

## دەستپێك

چیرۆك یەكێكە لەو هۆكارە زۆرانەی قورئانی پیرۆز، كە خوای گەورە بۆ بەدیهێنانی ئەو ئامانجە كە قورئان لەپێناویدا نێردراوە، هێناویەتی. ئەو ئامانجەش سەرجەم سوورەتەكانی قورئانی پیرۆزی ڕێكخستووە بە جیاوازیی مەبەستی هەر سوورەتێك كە لە كۆتاییدا سەرجەمیان ئامانجێكی بنەڕەتی پێكدەهێنن، كە قورئان لەپێناوی ئەو ئامانجە بنەڕەتییەدا دابەزیوە، ئەو ئامانجەش لە سێ خاڵدا كورت دەبێتەوە:

یەكەم: سەلماندنی ئەوەی كە قورئانی پیرۆز پەرچوو "موعجیزە"یە و مرۆڤ توانای هێنانی هاوشێوەی قورئانی نییە، ئەمەش واتە سەرچاوەی قورئانی پیرۆز لە مرۆڤەوە نییە.

دووەم: پاش سەلماندنی یەكەم، بە دوایدا ئەوەش دەسەلمێت كە ئەو پێغەمبەرەی ئەم قورئانەی پێدانێردراوە، ڕاستە و ڕاستگۆیە و لەلایەن نێردەرێك و سەرچاوەیەكی نامرۆییەوە نێردراوە.

سێهەم: كە گرنگترینیانە، ئامانجی پەیامەكە خۆیەتی، ئەوەیە كە بە سەلماندنی خاڵی دووەم بە بەڵگەی خاڵی یەكەم، ڕاستییەتی ئەو شتانەش دەسەلمێت كە ئەم پێغەمبەرە هێناونی، كە ئەوەش كرۆك و جەوهەری ئەم ئاینەیە، كە بریتییە لە "وەحدانییەتی پەروەردگاری بەدیهێنەری گشت شتێك و، دروستكەری ئەو پێغەمبەرە و نێردەری ئەم قورئانە".

قورئانی پیرۆز لەسەر ئەم سێ خاڵە بنیاتنراوە و لە دەوری ئەمانە دەخولێتەوە، ئەگەرچی شێواز و ڕێگاكانی وێناكردن و گوزارشتلێكردن و

هۆكارەكانی سەلماندن و جۆرەكانی بەڵگەهێنانەوە، لەسەر یەكێك لەو سێ خاڵە، یان هەمووی، جیاواز بێت.

جا چیرۆكە قورئانییەكان، كە لەمیانەی سوورەتەكانی قورئاندا هەن، بۆ ئەوە هاتوون هەمان ئامانج كە قورئانی لە پێناودا دابەزیوە، بهێننەدی. هاوكات بۆ بەدیهێنانی هەندێك ئامانجی دیكە، كە پەیوەندیی بە چیرۆكەكە خۆی و ئەو سوورەتەوە هەیە كە تیایدا هاتووە، بەڵام لە كۆتاییدا لەگەڵ ئامانجە گەورەكەی قورئاندا یەكدەگرێتەوە.

ئێمە لەم كتێبەدا، هەوڵدەدەین چەند تیشكێك بخەینە سەر ئەو چیرۆكە قورئانییانە، بە پشتبەستن بە هونەری چیرۆك و لایەنە ئەدەبییە باوەكان.

بەڵێ، بە پشتبەستن بە تەكنیكی چیرۆك و لایەنە ئەدەبییەكان، بەڵام دەبێت ئەوەمان لەبیرنەچێت كە لە بنەڕەتدا قورئانی پیرۆز، كتێبی ئاینە نەك هونەر، كتێبی دینە نەك ئەدەب، بەڵام هاوتەریب بە زانینی ئەم ڕاستییە، دەبێت ئەوەش بەهەند وەرگرین كە موعجیزە و پەرچووی قورئان لە ڕەوانبێژی و دەربڕینەكانیدایە و ئەمەش پەیوەندییەكی توندوتۆڵی بە هونەرەوە هەیە.. پاشئەوەی مرۆڤ مانای "چیرۆكی هونەری" زانی و لە شارستانێتی نوێدا بنەما و ڕەگەزەكانی دیاریكران، ئەوكات هەندێك لە توێژەران دیقەتیان دا زۆر لە بنەما و ڕێساكانی ئەم هونەرە، پێشتر لە قورئاندا هاتوون و بەدیدەكرێن، ئەوەش تەنها لە ڕێی "وشە"وە، بەڵێ.. وشە، ئەو وشەیەی كە لە ڕێیەوە هەموو ڕوویەكی هونەریی چیرۆكی پێ دروست دەكرێت.

# دەروازەی یەکەم

## چەند تیشکێك بۆ سەر تایبەتمەندییەکانی چیرۆکەکانی قورئانی پیرۆز

## بەشی یەکەم
## گونجاوی چیرۆکە قورئانییەکان
## لەگەڵ مەبەستەکانی هاتنەخوارەوەی قورئاندا

مەبەست لەم خاڵە ئەوەیە، کە هیچ چیرۆکێکی قورئان بەبێ هۆ لە شوێنێکدا باسنەکراوە، لە هەر سوورەتێکدا باسی چیرۆکێك کرابێت، ئامانج لێی بەستنەوەی چیرۆکەکەیە بە مەبەستی سەرەکی سوورەتەکە و پاشانیش بە ئامانجە سەرەکییەکەی هاتنەخوارەوەی قورئان، با نموونەیەك لەوبارەوە وەربگرین، سوورەتی "الأعراف".

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ الٓمٓصٓ ۝١ كِتَٰبٌ أُنزِلَ إِلَيۡكَ فَلَا يَكُن فِي صَدۡرِكَ حَرَجٞ مِّنۡهُ لِتُنذِرَ بِهِۦ وَذِكۡرَىٰ لِلۡمُؤۡمِنِينَ ۝٢ ٱتَّبِعُواْ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكُم مِّن رَّبِّكُمۡ وَلَا تَتَّبِعُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءَۗ قَلِيلٗا مَّا تَذَكَّرُونَ ۝٣ ﴾ (الاعراف: ١ـ ٣)

واتە: (ئەم قورئانە کتێبێکە و بۆت هاتووەتە خوارەوە، کەوابوو با سەغڵەتیی لە دڵ و دەروونتدا نەبێت (لە گەیاندنیدا)، بۆ ئەوەی خەڵکی پێ بێدار بکەیتەوە، هەروەها یادەوەریشە بۆ ئیمانداران. شوێنی ئەو (بەرنامەیە) بکەون کە لەلایەن پەروەردگارتانەوە بۆتان هێنراوەتە

خوارەوە، جگە لەو زاتە شوێنی هیچ پشتیوان و خۆشەویستێکی تر مەکەون، کەم یادەوەری و پەندوەردەگرن و بیردەکەنەوە!).

لێرەدا دەبینین، خوای گەورە باسی ئەو "کتێب"ـەی کردووە کە ناردوویەتییە خوارەوە بۆ پێغەمبەرەکەی (درووود ی خوای لێبێت)، داوای لێدەکات ئارام بگرێت و خۆڕاگربێت لەسەر بانگەوازکردن بۆ لای پەروەردگار بەم کتێبە، پاشان ئاڕاستەی گفتوگۆ و قسەکان دەکاتە بەندەکانی، فەرمانیان پێدەکات و ڕێگرییان لێدەکات لەو پەتایەی کە مرۆڤ هەمیشە تووشی دەبێت، کە دڵیان ڕەق دەبێت و بەڵگە و نیشانەکانی خوایان لەبیردەچێتەوە، ئەم فەرمان و نەهییە، پێویست دەکات سەرەنجامی میللـەتانی دیکەی بەسەردا باسبکرێت، کە چارەنووسیان چی لێهات، بەڵام باسەکە بەشێوەی "گشتگیر"، نەك "بەدیاریکراوی" باسی میللەتێك. دەفەرموێت: ﴿ وَكَم مِّن قَرْيَةٍ أَهْلَكْنَاهَا فَجَاءَهَا بَأْسُنَا بَيَاتًا أَوْ هُمْ قَائِلُونَ ﴿٤﴾ فَمَا كَانَ دَعْوَاهُمْ إِذْ جَاءَهُم بَأْسُنَا إِلَّا أَن قَالُوا إِنَّا كُنَّا ظَالِمِينَ ﴿٥﴾ فَلَنَسْأَلَنَّ الَّذِينَ أُرْسِلَ إِلَيْهِمْ وَلَنَسْأَلَنَّ الْمُرْسَلِينَ ﴿٦﴾ ﴾ (الأعراف: ٤ –٦)، واتە: (چەندەها شار و دێهاتمان وێران و کاول کرد، لەکاتێکدا لە شەودا خەوتبوون، یان لە کاتی پشووی نیوەڕۆدا بوون، کتوپڕ سزا و تۆڵەی ئێمە یەخەی پێگرتن. ئەو کاتە کە سزای ئێمە یەخەی پێگرتن، ئینجا قسە و گوفتار و دوعا و نزایان هیچ نەبوو تەنها ئەوە نەبێت دەیانووت: بەڕاستی ئێمە ستەمکار بووین،

بەڕاستی ئێمە یاخی بووین. ئنجا سوێند بێت بە خوا، بێگومان ئێمە پرسیار دەکەین لەوانەی کە پێغەمبەرانیان بۆ ڕەوانە کراوە، سوێند بێت بە خوا، لە پێغەمبەرانیش دەپرسینەوە دەربارەی هەڵوێستی ئەو خەڵکە بەرامبەریان). تا دەگاتە ئامانجی ئەوەی بۆچی چیرۆك باسدەکرێت و مەبەست لە هێنانی چیرۆك چییە، دەفەرموێت: ﴿ فَلَنَقُصَّنَّ عَلَيْهِم بِعِلْمٍ وَمَا كُنَّا غَآئِبِينَ ۝٧ ﴾ (الأعراف: ٧) واتە: (ئنجا سوێند بێت بە خوا، بەڕاستی هەموو بەسەرهاتەکان لەسەر بنچینەی زانیاری و ئاگاداری تەواو دەخەینە ڕوو و دەیلێینەوە بۆیان، ئێمە بێئاگا نەبووین لە هەڵسوکەوتیان)، ئەمەش بۆ ئەوەی ئەم چیرۆکانە پەند بن بۆ ئەوانەی دوای خۆیان، واتە بۆ ئوممەتی قورئان و ئاگادارکەرەوە بێت بۆ هاتنی سزا بۆ ئەوانەی بەدرۆی دەزانن و مژدەدەر بێت بۆ ئەوانەی بە ڕاستی دەزانن، دەفەرموێت: ﴿ وَٱلْوَزْنُ يَوْمَئِذٍ ٱلْحَقُّ ۚ فَمَن ثَقُلَتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ۝٨ وَمَنْ خَفَّتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُم بِمَا كَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا يَظْلِمُونَ ۝٩ ﴾ (الأعراف: ٨ـ ٩) واتە: (تەرازوو پێوەری ڕاست و دروست لەو ڕۆژەدایە، پاشان ئەوەی تای تەرازووی (خێر و چاکەکانی) سەنگین بێت، ئەوە ئیتر ئەو جۆرە کەسانە سەرکەوتوو و سەرفرازن. ئەوەش تای تەرازووی (خێر و چاکەکانی سووك بێت)، ئەو جۆرە کەسانە ئەوانەن کە خۆیان دۆڕاند و خۆیان لەدەستدا، بەهۆی ئەوەی کە بڕوایان بە بەڵگە و ئایەتەکانی ئێمە نییە و ستەم دەکەن).

بەمشێوەیە، چیرۆکە گشتگیرەکە دەبێتە نموونەیەکی گشتی و لە سەرەتای سوورەتەکەوە باسدەکرێت، تا ئەو مەبەستە ڕوونبکاتەوە کە چیرۆکەکان بەگشتی و چیرۆکەکانی ناو ئەو سوورەتە بەتایبەتی بۆی هاتوون، کە ئامانجە سەرەکییەکە بریتییە لە باسکردنی موعجیزەیەکی پێغەمبەرێکی نێردراو لە لایەن خواوە، بۆ بانگکردنی خەڵکی بۆ یەکتاپەرستی و داننانیان بە فەزڵی خوا بەسەر خەڵکییەوە، بەوەی کە دروستیکردوون و کردوونیەتییە جێنشین لەسەر زەویدا، دەفەرموێت:

﴿ وَلَقَدْ مَكَّنَّٰكُمْ فِي ٱلْأَرْضِ وَجَعَلْنَا لَكُمْ فِيهَا مَعَٰيِشَ ۗ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ﴿١٠﴾ وَلَقَدْ خَلَقْنَٰكُمْ ثُمَّ صَوَّرْنَٰكُمْ ثُمَّ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ ﴾ (الاعراف: ١٠ ـ ١١) واتە: (بەڕاستی ئێمە ئێوەمان نیشتەجێ کرد لەم زەوییەدا و دەسەڵاتمان پێبەخشین و جۆرەها هۆکاری ژیانمان تیایدا بۆ سازاندوون، کەچی سوپاسی کەمی نیعمەتەکان دەکەن، یان کەمتان سوپاسگوزارن. بەڕاستی ئێمە (باوە گەورەی) ئێوەمان دروستکرد و نەخش و نیگاری ڕواڵەت و ڕوخساری ئێوەمان کێشا، پاشان وتمان بە فریشتەکان: ئادەی سوژدەبەرن بۆ ئادەم، جا هەموو فریشتەکان سوژدەیان برد، جگە لە ئیبلیس)، ئیتر بەمشێوەیە سوورەتەکە بەردەوام دەبێت لە گێڕانەوەی چیرۆکی ژمارەیەك نەتەوە و پێغەمبەران، هەر لە ئادەمەوە، لە ناوبەینەکانیدا باس لە نیعمەتەکانی خوا و فەرمان و نەهییەکانی دەکرێت، بەڵام بەجۆرێك کە لەگەڵ هەر

چیرۆکێکیاندا بگونجێت و ببێته شوێنی بەڵگەهێنانەوە بە ڕووداوەکانی چیرۆکەکە.

لەمیانەی چیرۆکەکاندا هاوشێوەی هەڵوێستی پێغەمبەری خۆمان، دەبینین لەگەڵ هۆزەکەیدا کە نکوڵی پەیامەکەیان دەکرد، ئەوەتا نووح بە هۆزەکەی دەڵێت: ﴿ أَوَعَجِبْتُمْ أَن جَاءَكُمْ ذِكْرٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنكُمْ لِيُنذِرَكُمْ ﴾ (الأعراف: ٦٣) واتە: (ئایا ئێوە سەرسام بوون لە هاتنی بەرنامە و یادخەرەوەیەك لەلایەن پەروەردگارتانەوە بۆ سەر پیاوێکی (ڕاستگۆ) لە خۆتان، تا بێدارتان بکاتەوە)، هەروەها هودیش بەهەمانشێوە، بە هۆزەکەی دەڵێت: ﴿ أَوَعَجِبْتُمْ أَن جَاءَكُمْ ذِكْرٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنكُمْ لِيُنذِرَكُمْ ﴾ (الأعراف: ٦٩) واتە: (ئایا ئێوە سەرسام بوون لە هاتنی بەرنامە و یادخەرەوەیەك لەلایەن پەروەردگارتانەوە بۆ سەر پیاوێکی (ڕاستگۆ) لە خۆتان، تا بێدارتان بکاتەوە)، تەنانەت هود (سەلامی خوای لێبێت) هەمان ئەرکی چیرۆکە قورئانییەکان دەڵێتەوە کە بیرخستنەوەی میللەتانی دیکەیە، هود دەفەرموێت: ﴿ وَٱذْكُرُوٓا۟ إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَآءَ مِنۢ بَعْدِ قَوْمِ نُوحٍ وَزَادَكُمْ فِى ٱلْخَلْقِ بَصْۜطَةً فَٱذْكُرُوٓا۟ ءَالَآءَ ٱللَّهِ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾ (الأعراف: ٦٩) واتە: (جا یادی ئەو کاتە بکەنەوە کە خوا ئێوەی کردە جێنشین لە دوای قەومی نووح، لە ڕووی جەستەوە زیاد لەوان گەورە و تێر و تەواو بەدیهێنان، کەواتە یادی ناز و نیعمەتەکانی خوا بکەن، بۆ ئەوەی سەرفراز بن)، دواتر ساڵح (سەلامی

خـوای لێبێـت) چـیرۆکی نەتـەوەکانی پـێش خۆیـان بـەبیر هۆزەکـەی دەهێنێتــەوە: ﴿ وَٱذۡكُرُوٓاْ إِذۡ جَعَلَكُمۡ خُلَفَآءَ مِنۢ بَعۡدِ عَادٖ ﴾ (الاعــراف: ٧٤) واتە: (یادی ئەو کاتەش بکەنەوە کە خوا ئێوەی کردە جێنشین لە دوای قەومی عاد)، دواتر سەرەنجانی هۆزەکەی (لوط) (سەلامی خـوای لێبێـت) دەبیـنین، کـە لـە کۆتاییـدا خـوای گـەورە ڕووی قسـە دەکاتـە پێغەمبەرەکـەی (محەممـەد) (سـەلامی خـوای لێبێـت) و دەفـەرموێت: ﴿ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُجۡرِمِينَ ٨٤ ﴾ (الاعراف: ٨٤) واتە: (بزانەو دیقەت بدە، سـەرئـەنجامی تاوانبـاران چـۆن بـوو)، تـا بـەبیری پێغەمبەرەکـەی بهێنێتـەوە کـە ئامـانجی باسـکردنی ئـەم چـیرۆکانە، دڵنیاکردنەوەیەتی لەوەی کە خوای گەورە مۆڵەت دەدات بە ستەمکاران تا بیانوویان نەمێنێت و پاشان کە گرتنی خراپ دەیانگرێت. لەبەرئـەوە خـوای گـەورە پـێش ئـەوەی سـەرلەنوێ دەسـتبکاتەوە بـە چـیرۆکی پێغەمبـەرانی دیکـە، باسوخواسـێك دەهێنێـت کـە تیایـدا فـەزڵی خـوا دەبینین لە مۆڵەتدان بە هۆز و نەتەوەکان و پەلەنەکردن لێیان و پێدانی هەل لەدوای هـەل و هێنـانی کـەمێك لـە نارەحـەتی بەسـەریاندا، بـەڵکو بگەڕێنەوە بۆ لای خوا (ئایەتەکانی ٩٤ تـا ١٠٠ی سـوورەتەکە)، کـە بـە ڕاسـتی باسوخواسـێکی ناخهەژێنـە. بـە دوایـدا جـارێکی دیکـە جـەخت لەسەر ئامانجی باسکردنی ئـەم چـیرۆکانە دەکاتـەوە بـەوەی کـە ڕووی قسە دەکاتەوە پێغەمبەرەکەی و دەفـەرموێت: ﴿ تِلۡكَ ٱلۡقُرَىٰ نَقُصُّ عَلَيۡكَ

مِنْ أَنۢبَآئِهَا ۚ وَلَقَدْ جَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَمَا كَانُوا۟ لِيُؤْمِنُوا۟ بِمَا كَذَّبُوا۟ مِن قَبْلُ ۚ كَذَٰلِكَ يَطْبَعُ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿١٠١﴾ ﴾ (الأعـــراف: ١٠١)

واته: (ئەو شار و ناوچانە هەندێك لە هەواڵ و بەسەرهاتەكانیانتان بۆ دەگێڕینەوە ، بێگومان پێغەمبەرانیان بۆ هات، هاوڕێ لەگەڵ چەندەها موعجیزەدا، ئیتر وەنەبێت ئەوانە باوەڕیان هێنابێت بەوەی كە پێشتر بڕوایان پێینەبوو، ئا بەو شێوەیە خوا مۆر دەنێت بەسەر دڵی بێباوەڕاندا). لەدوای ئەمەوە چیرۆكی مووسا پێغەمبەر دێت، كە زۆرینەی پاشماوەی سوورەتە پیرۆزەكە داگیر دەكات، تەنها لە كۆتایی چیرۆكەكەیدا نەبێت كە نموونەی زانایەكی بەنی ئیسرائیل دەهێنێتەوە، كە ئەویش هەر چیرۆكە و خوا زانستی كتێبی خۆی پێبەخشیوە، بەڵام بێباوەڕ دەبێت پێی.

دواهەمین قسەی پەروەردگار لەسەر چیرۆكەكان، ڕووكردنە پێغەمبەرەكەیەتی بەوەی كە دەفەرموێت: (﴿ فَٱقْصُصِ ٱلْقَصَصَ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿١٧٦﴾ ﴾ (الأعراف: ١٧٦) واتە: (ئەم جۆرە بەسەرهاتانە بگێڕەرەوە، بۆ ئەوەی (دابچڵەكێن و) بیر بكەنەوە).

بەمشێوەیە، دەبینین چیرۆك لە قورئاندا بەشێكە لە پێكهاتە بەهێزەكەی، كە بۆ خۆشی و كات كوشتن و باسوخواسی ئەفسانەیی و حیكایەتخوانی ناهێنرێتەوە، بەڵكو چیرۆكەكان بەشێكن لەو بابەتە سەرەكییەی كە خوای گەورە جەختی لەسەر دەكات لە سوورەتەكەیدا،

به بەڵگەهێنانەوە لەسەر ڕاستیی ئەم پێغەمبەرە، جا دەبینین لە هەندێك شوێندا ئەو قسەوباسە کە لە دوای چیرۆکێکەوە دێت، یان لە نێوان چیرۆکەکاندا دێت، هەندێك فراوان و بەربڵاو دەبێت تا دەبێتە وتووێژێك و دیالۆگێك لە نێوان پێغەمبەرێکدا کە ناوی ناهێنێت لەگەڵ نەیارەکانی، هەریەك لەو پێغەمبەرە و نەیارەکانی، بەڵگەی خۆیان باس دەکەن و وتووێژی لەسەر دەکەن، تا لە کۆتاییدا باسی سەرەنجامەکەی دەکات و کۆتایی باسەکەش دیسانەوە بەگەڕانەوە بۆ ئامانجە سەرەکییەکە دێت، کە پەروەردگار ڕوودەکاتەوە پێغەمبەرەکەی و سەرەنجامی ئەوانەی کە قورئان بە درۆ دەزانن، دەخاتەڕوو، سەیری ئەم نموونەیە بکە: ﴿وَكَذَٰلِكَ مَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ فِي قَرۡيَةٖ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتۡرَفُوهَآ إِنَّا وَجَدۡنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٖ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّقۡتَدُونَ ﴿٢٣﴾ قَٰلَ أَوَلَوۡ جِئۡتُكُم بِأَهۡدَىٰ مِمَّا وَجَدتُّمۡ عَلَيۡهِ ءَابَآءَكُمۡۖ قَالُوٓاْ إِنَّا بِمَآ أُرۡسِلۡتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿٢٤﴾ فَٱنتَقَمۡنَا مِنۡهُمۡۖ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُكَذِّبِينَ ﴿٢٥﴾﴾ (الزخرف: ٢٣ـ ٢٥) واتە: (هەر بەوشێوەیە، هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردووە بۆ هیچ شارێك، کە خۆشگوزەرانەکان نەیانوتبێت: ئێمە باووباپیرانی خۆمان بینیوە پابەندی بیروباوەڕێك بوون، بێگومان ئێمەش چاو لەوان دەکەین و پەیڕەویی ئەوان دەکەین. پێغەمبەرەکەش وتوویەتی: باشە... ئەگەر لە ڕێگە و ڕێبازو بەرنامەی باووباپیرانتان چاکتریشم بۆ هێنان هەر شوێنیان دەکەون؟! لە وەڵامدا وتیان: بەڕاستی ئێمە بەو بەرنامە و

پەیامەی کە بەئێوەدا ڕەوانەکراوە بڕوا ناکەین. جا ئێمەش تۆڵەمان لێسەندن، سەرنج بدە و ببینە سەرئەنجامی ئەوانەی بڕوایان بە پەیامی پێغەمبەران نەکرد، چۆن بوو؟).

جا یەکێکی دیکە لەو وردبوونەوانەی لەو چیرۆکانەوە دەستماندەکەوێت، کە ناوی کاراکتەرەکانیان دەستنیشان نەکراوە، ئەوەیە کە قورئان کتێبێکی مێژوویی یان ژیاننامەیی نییە، بەڵکو پەیام و نێردراوی خوای گەورەیە و پڕە لە دانایی و حیکمەتی نەبڕاوە، هەر لەبەرئەوەش لە چەندین شوێنی قورئاندا چیرۆك هاتووە، بەبێ دیاریکردنی ناوی ئەو کەسانەی تیایدا بوونیان هەیە.

یاخود لەبارەی گونجاویی چیرۆك لەگەڵ مەبەستەکانی دابەزاندنی قورئاندا، هەندێك چیرۆك هەن بۆ باسکردنی توانا و قودرەتی خوای گەورەیە، وەك چیرۆکی ئیبراهیم: ﴿رَبِّ أَرِنِي كَيْفَ تُحْيِ الْمَوْتَىٰ﴾ (البقره: ٢٦٠) واتە: (پەروەردگارا، نیشانم بدە چۆن مردوو زیندوو دەکەیتەوە)، یان چیرۆکی ئەو پیاوەی کە بە لای شارە وێرانەکەدا تێپەڕیبوو: ﴿أَنَّىٰ يُحْيِي هَٰذِهِ اللَّهُ بَعْدَ مَوْتِهَا ۖ فَأَمَاتَهُ اللَّهُ مِائَةَ عَامٍ ثُمَّ بَعَثَهُ﴾ (البقرة: ٢٥٩) واتە: (ئاخۆ خوای گەورە چۆن خەڵکی ئەم شارۆچکەیە دوای مردنیان زیندوو دەکاتەوە)، هەروەها چیرۆکی هاوڕێیانی ئەشکەوت.

یاخود هەندێکجار، جۆرە چیرۆکێك وەك بەڵگە بۆ کارێکی بینراو، یان کارێکی غەیبی و نادیار باس دەکرێت، ئەم جۆرە چیرۆکانە زیاتر بەم دەستەواژانە دەستپێدەکات:

﴿ وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا رَّجُلَيْنِ ﴾ (النحل: ٧٦) واتە: (خوا نموونەی هێناوەتەوە بە دوو پیاو).

﴿ وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا قَرْيَةً ﴾ (النحل: ١١٢) واتە: (خوا نموونەی هێناوەتەوە بە گوندێك).

﴿ وَٱضْرِبْ لَهُم مَّثَلًا رَّجُلَيْنِ ﴾ (الكهف: ٣٢) واتە: (نموونەی دوو پیاویان بۆ بهێنەرەوە).

﴿ ضَرَبَ لَكُم مَّثَلًا مِّنْ أَنفُسِكُمْ ﴾ (الروم: ٢٨) واتە: (خوا هەر لە خۆتان نموونەی بۆ هێناونەتەوە).

﴿ إِنَّمَا مَثَلُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ﴾ (یونس: ٢٤) واتە: (بەڕاستی نموونەی ژیانی دونیا وەك...).

هەندێکجاریش ئەم جۆرە چیرۆکە، کە وەك پەند هاتووە، هەندێك لە کەسایەتییەکانی، یان شوێنەکەی، یان کاتەکەی، باسدەکرێن، وەك:

﴿ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱمْرَأَتَ نُوحٍ وَٱمْرَأَتَ لُوطٍ ۖ كَانَتَا تَحْتَ عَبْدَيْنِ مِنْ عِبَادِنَا صَٰلِحَيْنِ ﴾ (التحريم: ١٠) واتە: (خوا نموونە بۆ ئەوانەی بێباوەڕن بە خێزانەکەی نووح و خێزانەکەی (لوط) دەهێنێتەوە، ئەوان خێزانی دووان لە بەندە پیاوچاکەکانی ئێمە بوون).

با نموونەیەکی دیکە وەرگرین، سوورەتی سەبەء، کە سەرەتاکەی بە سوپاسکردنی پەروەردگار دەستپێدەکات، کە فێری ئیمانداران دەکات چۆن شوکرانەبژێریی بۆ خوا دەرببڕن و سوپاسگوزاری بن: ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَلَهُ ٱلْحَمْدُ فِى ٱلْءَاخِرَةِ ﴾ (السبأ: ١) واتە: (سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، هەر هەمووی ئەو خاوەنێتی، سوپاس و ستایش لە قیامەتدا هەر پێشکەش بەو دەکرێت). لەگەڵ چیرۆکەکانی ناو سوورەتەکە، لەوانە چیرۆکی شاژنە بەڵقیس، کە تیایدا فەرمان بە خەڵك و دەسەڵاتدارانی وڵاتەکە دەکات، سوپاسگوزاری خودا بن: ﴿ كُلُوا۟ مِن رِّزْقِ رَبِّكُمْ وَٱشْكُرُوا۟ لَهُۥ ﴾ (السبأ: ١٥) واتە: (بخۆن لە ڕزق و ڕۆزی پەروەردگارتان و سوپاسگوزاری بن). هەروەها لە چیرۆکی داوود و سولەیماندا لە هەمان سوورەتدا، کە دووبارە داوا لە خانەوادەی داوود دەکات سوپاسگوزاری خوا بن: ﴿ ٱعْمَلُوٓا۟ ءَالَ دَاوُۥدَ شُكْرًا ۚ وَقَلِيلٌ مِّنْ عِبَادِىَ ٱلشَّكُورُ ﴿١٣﴾ ﴾ (السبأ: ١٣) واتە: (ئەی نەوە و شوێنکەوتووانی داوود: ئێوە بە کردار و گوفتار سوپاسگوزار بن، هەرچەندە کەمێك لە بەندەکانم سوپاسگوزارن)، بەوەش دەردەکەوێت چۆن چیرۆکە قورئانییەکان لە سوورەتەکەدا لەگەڵ مەبەستی سەرەکیی سوورەتەکەدا دەگونجێت.

**تێبینی**:

سەبارەت بە گونجاویی چیرۆکە قورئانییەکان لەگەڵ مەبەستەکانی دابەزینی قورئاندا، تێبینی ئەوە دەکەین، چیرۆکەکانی ناو سوورەتە مەککییەکان تایبەتمەندیی خۆیان هەیە بە بەراورد بە چیرۆکەکانی ناو سوورەتە مەدەنییەکان، سوورەتە مەککییەکان بەشێوەیەکی گشتی، باس لە بابەتەکانی عەقیدە و بیروباوەڕ دەکەن، لەبەرئەوە چیرۆکەکانیشیان زیاتر باس لە میللەتانی دیکە دەکەن کە بێباوەڕ بوون بە پێغەمبەرەکانیان، لە بارەی یەکتاپەرستی و وازهێنان لە پەرستنی شتانی دیکە، ئەمە بە شێوەیەکی ڕوون لە چیرۆکەکانی سوورەتەکانی "ئەنعام و ئەعراف و یونس و هود و یوسف و ئیبراهیم و حیجر و کەهف و مەریەم...."دا دەردەکەون، هەرچی سوورەتە مەدەنییەکانە، چیرۆکەکانی ناویان زیاتر "کورت"ن و بابەتەکانی لەگەڵ ئامانجەکانی تەشریع و کاروباری بەڕێوەبردندا دەگونجێن، لەگەڵ درێژەدان بە بابەتەکانی عەقیدە و بانگەواز، بەڵام بە شێوەیەکی کەمتر لە سوورەتە مەککییەکانی سەرەتای قۆناغی مەککە، هەرچی سوورەتەکانی کۆتایی قۆناغی مەککە و سەرەتای هیجرەتە - وەك سوورەتی اسراء - قۆناغێکی ناوەندییە لە نێوان ئەو دوو قۆناغەدا کە باسمانکرد.

# بەشی دووەم
# هەڵبژاردنی ڕووداوەکان لە ناو چیرۆکدا

دوای ئـەوەی زانیمـان کـە چـیرۆکە قورئانییـەکان لەگـەڵ مەبەسـتی سەرەکیی سوورەتەکە، باسدەکرێن، لەم بەشـەدا باسـی ئـەوە دەکـەین کە ڕووداوەکانی ناو چیرۆکێك ئەویش بەهەمانشـێوە بـەپێی گونجانیـان لەگـەڵ مەبەسـتی سـەرەکیی سـوورەتەکە هەڵدەبـژێردرێن، بـۆ نموونـە چیرۆك هەیە ڕووداو "حدث"ێکی باسـکراوە و ڕووداوەکـانی دیکـەی بـە هیچ شـێوەیەك ئامـاژەی بـۆ نـەکراوە، وە خراوەتـە شـوێنێکی دیکـەی سوورەتەکە، یان هەر بـە تـەواویی لـە سـوورەتێکی دیکـەدا ئامـاژە بـە تەواوکەرەکـەی دراوە، هۆکـاری سـەرەکییش لـەم کـارەدا بریتییـە لـە "گونجاویی" ئەو بەشەی چیرۆکەکە لەگەڵ مەبەستی ئـەو سـوورەتەدا، ئەمـەش بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی کـە قورئـانی پـیرۆز کتێبێکـی حیکـاتخوانیی، یـان مێـژوویی نییـە، تـا بێـت هـەموو چـیرۆکەکە بـە وردەکارییەکانییەوە بگێڕێتەوە، بەڵکو چیرۆك، ئـەرکی خـۆی هەیـە لـە قورئاندا، ئەو ئەرکەش بریتییە لە دوو شت:

یەکەم: نەپچڕانی سیاقی سوورەتەکە و قووڵنەبوونەوەی زیاد لە پێویست لە چیرۆکەکەدا، کە ببێتە هۆی تێکدانی بابەتەکە و بەوەش گوێگر لە مەبەستە سەرەکییەکە دوور بخاتەوە.

دووەم: لەناو ڕووداوەکانی چیرۆکەکەدا جەختبکرێتەوە لەسەر ئەو بەشانەی کە ئامانجی سوورەتەکە دەپێکن و چیرۆکەکە لە پێناویدا باسکراوە. بە لەبەرچاوگرتنی ئەم دوو خاڵە، دیقەت دەدەین چیرۆکەکانی قورئان چەند جۆرێکن:

هەیانە لە ناو سوورەتەکاندا هاتوون، وەك بەڵگەیەك لەسەر بابەتێکی دیاریکراو، هەیانە یەك سوورەتی تەواو، یان زۆرینەی سوورەتێکی گرتووە، هەیانە دووبارە کراوەتەوە و لە چەند سوورەتێکدا باسکراوەتەوە تا لەگەڵ مەبەستی سوورەتەکەدا بگونجێت، هەیانە یەك جار باسکراوە، چیرۆك هەیە کورتە، جا چ چیرۆکی پێغەمبەران و نەتەوەکانیان بێت، یان چیرۆکی دابڕدراو لە کات و شوێن و کەس "زەمان و مەکان و شەخص"، یان ئەو چیرۆکانەی باس لە جیهانی پەنهان "غەیب" دەکەن، وەك چیرۆکی دروستبوونی ئادەم و چیرۆکەکانی ڕۆژی قیامەت و لێپرسینەوە و بەهەشت و دۆزەخ.

جا لە هەموو ئەم چیرۆکانەدا، ڕووداوەکان هەڵدەبژێردرێن و تەرکیز دەخرێتە سەریان، هەندێك ڕووداوی لێ لادەبرێن و باسناکرێن، یان دواخراون بۆ شوێنێکی دیکەی سوورەتەکە، یان سوورەتێکی دیکە.

لەبەرئەوە هەڵبـژاردنی ڕووداوەکـان لـە نـاو چـیرۆکێکدا، وایکـردووە چیرۆکەکانی قورئان دابـەش بـبن بەسـەر هـەموو قورئانـدا، یـەکێك لـەو چیرۆکانەی کە زۆرترین بـەربڵاویی هەیـە، چـیرۆکی مووسـا پێغەمبـەرە لەگەڵ بەنی ئیسرائیل، کە "بەیەکەوە" و بە "پچڕپچڕیی" بـە شـێوەی چیرۆك یان هەواڵ، لە نزیکەی (٣٠) شوێندا هاتووە، هـەروەها چـیرۆکی ئیـبراهیم (سـەلامی خـوای لێبێـت) لـە نزیکـەی (٢٠) شـوێن و عیسـا (سەلامی خوای لێبێت) لـە نزیکـەی (١٠) شـوێندا هـاتوون.... هەنـدێك چیرۆکی دیکـە یـەکجار هـاتووە و دووبـارە نەبووەتـەوە، وەك چـیرۆکی "هاوڕێیـانی ئەشـکەوت" و "بەنـدە پیاوچـاکەکەی هـاوڕێی مووسـا" و "زولقەرنەین" و.....هتد.

## تایبەتمەندیی چیرۆکی سوورەتە مەککەیی و مەدینەییەکان:

هەر لە ڕووی هەڵبژاردنی ڕووداوەکان بەپێی مەبەست، تێبینی ئەوە دەکەین، کە چیرۆکەکانی ناو سوورەتە مەککییەکان درێژترن لە چیرۆکەکانی ناو سوورەتە مەدەنییەکان، هەروەها زۆرترین ڕووداویان تێدایە و نزیکترن لە شێوە هونەرییەکەی چیرۆك کە بە "پێشەکی" و "ناساندن" دەستپێدەکات، تا دەگاتە "گرێ" و "کۆتایی"ـەکەیشی بە سەرکەوتنی ڕەگەزەکانی چاکە و لەناوچوونی ڕەگەزە خراپەکان، تەواو دەبێت. دواتر لە کۆتاییەکانی سەردەمی مەککەدا، چیرۆکەکان کەم دەبنەوە، لەبەرئەوەی زۆرینەی ڕووداوەکانیان باسکراون و ناسراوبوون،

ئاسان بوو بۆ گوێگر کە بە ئاماژەیەکی بچووك لە چیرۆکەکە بەتەواویی تێبگات و مەبەستی سەرەکیی هەڵبگۆزێت، ئەم شێوەیە لە چیرۆکی سوورەتە مەدەنییەکانیشدا درێژەی پێدرا و زیاتر "هەڵبژاردنی ڕووداوەکان" بووە جێی گرنگی، زۆرترینی چیرۆکەکانی سوورەتە مەدەنییەکان لە "هەواڵ"ـەوە نزیکن تا "چیرۆك"، تەنها کەمێکی نەبێت کە بە تەواویی باسکراون، وەك چیرۆکی "دوو کوڕەکەی ئادەم و قەلەڕەشەکە" لە سوورەتی مائیدە، کە ئەویش زیاتر "هەواڵێکی تەواوەتییە" و بەشێك لە ڕۆحی چیرۆکی تێدایە.ئەنجا با نموونەیەك باس بکەین:

## چیرۆکی یوسف ( سەلامی خوای لێبێت )..

وەك لای هـــەموومان ئاشـــکرایە، چـــیرۆکی ئـــەم پێغەمبـــەرە بـــە تێروتەسەلی لە سـوورەتێکی تـەواودا باسـکراوە، کـە بـەناوی خۆیـەوە ناونراوە، جگە لەوە، لە هیچ شوێنێکی دیکـەی قورئانـدا باسـی یوسـف نـەکراوە، جگـە لـە یـەك ئایـەت.. سـوورەتی یوسـف، چـیرۆکی یوسـف لەخۆدەگرێت، بە جۆرێك دڵ کەمەندکێش دەکات و بـیری مـرۆڤ بـە لای خۆیدا ڕادەکێشێت.. بەڵام یەك شت بـاس ناکـات، بـەڵێ ئـەم سـوورەتە دوور و درێژە هەموو شتێکی لە بارەی یوسفەوە باسـکردووە یـەك شـت نەبێت، ئەویش باسی پێغەمبەرایەتییەکەیەتی، یان ئەوەی کە بۆ چ گەل و هۆز و ئوممەتێك نێردراوە، لەکاتێکدا ئەو سوورەتە لە چەندین شوێندا

باسی چەندین خەسڵەتی یوسفی کردووە، بەڵام باسی پێغەمبەرایەتییەکەی نەکردووە.. بۆ نموونە سەیری ئەم سیفات و خەسڵەتانەی یوسف بکە:

١ـ ﴿ وَكَذَٰلِكَ يَجۡتَبِيكَ رَبُّكَ وَيُعَلِّمُكَ مِن تَأۡوِيلِ ٱلۡأَحَادِيثِ ﴾ واتە: (بەو شێوەیە خوای پەروەردگارت تۆ دیاریدەکات و هەڵتدەبژێرێت و هەندێك لێکدانەوەی خەونت فێر دەکات)، خوا هەڵیبژاردوویت و زانستی خەو لێکدانەوەی فێرکردوویت، (ئیجتیبا) بۆ یوسف و بۆ غەیری پێغەمبەرانیش بەکارهاتووە: ﴿ ٱللَّهُ يَجۡتَبِيٓ إِلَيۡهِ مَن يَشَآءُ ﴾ (الشورى: ١٣) واتە: (خوای دانا، خۆی کەسانی شایستە هەڵدەبژێرێت)، کەواتە مەبەست لە "هەڵبژاردن"ی یوسف، پێغەمبەرایەتییەکەی نییە.

٢ـ هەروەها لە شوێنێکی دیکەدا دەفەرموێت: وەحیمان بۆ نارد: ﴿ وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡهِ لَتُنَبِّئَنَّهُم بِأَمۡرِهِمۡ هَٰذَا ﴾ واتە: (لەوکاتەدا نیگامان بۆ نارد کە: هەواڵی ئەم بەسەرهاتە لەئایندەدا بە براکانت دەدەیت)، بەڵام بەپێی قورئانی پیرۆز، نیگا و وەحی تایبەت نییە تەنها بە پێغەمبەرانەوە و بەس، بەڵکو بۆ مرۆڤەکانی دیکەش، باسی ناردنی وەحی کراوە، وەك دایکی مووسا: ﴿ وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ ﴾ واتە: (نیگامان نارد بۆ دایکی مووسا)، یان بۆ (هەنگ): ﴿ وَأَوۡحَىٰ رَبُّكَ إِلَى ٱلنَّحۡلِ ﴾ (النحل: ٦٨). کەواتە ئەوەش واتە (أوحینا ـ وەحیمان بۆ نارد) باسی پێغەمبەرایەتییەکەی نییە.

٣ـ هەروەها باسی تەمکینی یوسف کراوە لەسەر زەوی، واتە پێدانی هێز و توانا، ﴿ وَكَذَٰلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي ٱلْأَرْضِ ﴾ واتە: (ئا بەو شێوەیە یوسفمان جێگیرکرد لە زەویدا و پایەدارمان کرد)، بەڵام تەمکینیش تایبەت نییە بە پێغەمبەرانەوە بە تەنها، ئەوەتا بۆ خەڵکی دیکەش بەکارهاتووە: ﴿ أَلَمْ يَرَوْا كَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَبْلِهِم مِّن قَرْنٍ مَّكَّنَّٰهُمْ فِي ٱلْأَرْضِ ﴾ (الانعام: ٦) واتە: (ئایا نەیانبینیوە و نەیانزانیوە چەندەها نەوەمان پێش ئەمان لەناوبردووە، کە پایەدارمان کردبوون لە زەویدا)..
کەواتە تەمکینیش باسی پێغەمبەرایەتییەکەی نییە.

٤ـ باسی ئەوە کراوە کە یوسف گەیشتووەتە پلەی پێگەیشتن (پێگەیشتووە) و خوا "دانایی" و "زانست"ی پێبەخشیوە، کە هەندێك پێیانوایە مەبەست پێغەمبەرایەتییە: ﴿ وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥٓ ءَاتَيْنَٰهُ حُكْمًا وَعِلْمًا ﴾ واتە: (کاتێکیش کە یوسف پێگەیشت و گەیشتە ئەوپەڕی تووندوتۆڵی (لە ڕووی لاشەو ژیرییەوە)، ئێمەش پلەی فەرمانڕەوایی دانایی و زانیاریی شارەزایی باشمان پێبەخشی)، بەڵام لە شوێنی دیکەی قورئاندا دەردەکەوێت "پێغەمبەرایەتی" جیاوازە لە "دانایی" و زانست، ئەوەتا دەفەرموێت: ﴿ مَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُؤْتِيَهُ ٱللَّهُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحُكْمَ وَٱلنُّبُوَّةَ ﴾ (آل عمران: ٧٩) واتە: (بۆ هیچ ئادەمیزاد و کەسێك نەگونجاوە کە خوا کتێبی ئاسمانی و فەرمانڕەوایی و پێغەمبەرایەتی

پێببەخشێت، لەوەودوا بە خەڵکی بڵێت: وەرن ببنە بەندەی من لە جیاتی ئەوەی بەندە و عەبدی خوا بن)، ئەوەتا دەردەکەوێت پێغەمبەرایەتی جیاوازە لە دانایی و فەرمانڕەوایی... کەواتە ئەم ئایەتەش واتە دانایی و زانیاری، مەبەست لێی باسی پێغەمبەرایەتی یوسف نییە...

٥- تەنانەت لەو ئایەتەشدا کە یوسف بانگەوازەکەی ئاشکرا دەکات، تەنها دوو زیندانییکراو لە گرتووخانەیەکی داخراودا هەن، کە یوسف بانگهێشتیان دەکات، پاشان پێیان ناڵێت من پێغەمبەرم و خوا ناردوومی بۆ هیدایەتی خەڵکی.. تاکە هەڵوێستێ کە یوسف تیایدا بانگەوازی کردبێت بۆلای پەروەردگار لەو چیرۆکە دوورو درێژەدا، تەنانەت لەو کاتەشدا کە قسە لەگەڵ پاشادا دەکات، بانگێشتی ناکات بۆ پەرستنی خوای تاکوتەنها و پێی ناڵێت من پێغەمبەرم، بەڵکو پێی دەڵێت: بمکە بە وەزیری کشتوکاڵ - بەمانا گشتییەکەی -، تەنانەت لە کۆتایی چیرۆکەکەشدا، کە یوسف لە مەقامی شوکردایە و نیعمەتەکانی خوا دەژمێرێت، باسی پێدانی دەسەڵات و لێکدانەوەی خەون دەکات وەك دوو نیعمەتی ئیلاهی، بەڵام باسی پێغەمبەرایەتی ناکات. تەنانەت ئەمە بۆ یەعقوبیش (سەلامی خوای لێبێت) ڕاستە، کە زیاتر لەم چیرۆکەدا وەك "باوك" ناسێنراوە و وەك پێغەمبەر باسنەکراوە.

ئێستا پرسیارەکە ئەوەیە، بۆچی لەم سوورەتە دوور و درێژەدا، هیچ باسی پێغەمبەرایەتی یوسف نەکراوە؟ بەڵکو تاکە ئایەتێك کە باس لە

پێغەمبەرایەتی یوسف بکات، خراوەتە شوێنێکی دیکەی قورئان و لەناو چیرۆکی مووسادا (سەلامی خوای لێبێت) باسکراوە؟ بۆ ئەم سوورەتە دوور و درێژە جێگەی ئەم ئایەتەی تێدانەبووەتەوە کە خوای گەورە باسی پێغەمبەرایەتییەکەی یوسف دەکات و خستوویەتییە سوورەتی (غافر ئایەتی ٣٤) و دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ جَآءَكُمْ يُوسُفُ مِن قَبْلُ بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَمَا زِلْتُمْ فِى شَكٍّ مِّمَّا جَآءَكُم بِهِۦ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا هَلَكَ قُلْتُمْ لَن يَبْعَثَ ٱللَّهُ مِنۢ بَعْدِهِۦ رَسُولًا﴾ واتە: (بەڕاستی کاتی خۆی یوسف بەڵگە و نیشانەی زۆری بۆ هێنان تا ڕێبازی خواناسی بگرنەبەر، کەچی بەردەوام لە گوماندا بوون بەرامبەر ئەو بەرنامە و ئاینەی کە بۆی هێنابوون، هەتا ئەو کاتەی وەفاتی کرد، ئەوسا وتتان: ئیتر تەواو، هەرگیز خوا دوای ئەم، پێغەمبەری تر نانێرێت)، ئەم قسەیە لە چیرۆکی مووسادا و لەسەر زاری ئەو پیاوە ئیماندارەی خزمی فیرعەون وتراوە، کە قسە لەگەڵ گەلەکەی دەکات و بیریان دەخاتەوە کە چارەنووسی گەلەکانی دیکە چۆن بووە و پاشان پەیامی یوسفیان بیردەخاتەوە و پێیان دەڵێت: پێشتریش یوسف بە چەندان بەڵگە و نیشانەی ڕوونەوە هاتە لاتان، کەچی لە پەیامەکەی ئەو بەگومان بوون، تا کاتێك کە مرد و وەفاتی کرد، ئەوسا وتتان ئیتر هەرگیز خوا دوای ئەو، هیچ پەیامبەرێکی دیکە نانێرێت...

**باسی سەرەکی ئەم بەشە بریتییە لە "هەڵبژاردنی ڕووداوەکان لە ناو چیرۆکدا"، پرسیارەکەش دووبارە ئەوەیە: بۆچی لە سوورەتی**

**یوسفدا باسی پێغەمبەرایەتییەکەی یوسفی نەکردووە و ئەو باسەی خستووەتە سوورەتێکی دیکە و لە یەك ئایەتدا باسی کردووە؟**

دیقەت بدەن بەڕێزان! چیرۆکی یوسف چیرۆکی ناسۆری باوك و کوڕێکە، کە بە هۆی کین و بوغزەوە لە یەك دابڕاون، باوکەکە تاڵ و سوێریی لەدەستدانی کوڕەکەی چەشت و خەمی زۆری خوارد بۆ چارەنووس و سەرەنجامی کوڕەکەی، کوڕەکەشی، چەندین بەڵاو ناڕەحەتی بەسەردا هات، کرا بە بەندە و دواتر خرایە زیندان. لەم سوورەتەدا بەزەیی خوا دەبینین بەرامبەر بە بەندە ساڵح و ئارامگر و چاکەکارەکانی، لەبەرئەوە ئەم چیرۆکە، جیاوازە لە سەرجەم چیرۆکی پێغەمبەرانی دیکە، بەوەی کە ئەم سوورەتە جەختی لەسەر لایەنی زاتی و سۆز و بەزەیی و لایەنی مرۆیی کردووە، کە ئەوەش لە دوو کەسایەتیی سەرەکیی چیرۆکەکە ڕەنگدەداتەوە، کە باوك و کوڕێکن: یەعقوب و یوسف، بەڵام چیرۆکی پێغەمبەرانی دیکە، جەخت لەسەر لایەنی بانگەواز و ململانێی پێغەمبەرەکە و گەلەکەی دەکاتەوە، بوارەکەش دەتوانێت باسوخواسی بانگەواز و ڕێنمایی و ئامۆژگاری و هەڵسەنگاندن و بواری تەشریع و یاسا و ڕێسا و یەکلاکردنەوەی کاروباری دین و دونیا، بگرێتەخۆ، بەپێچەوانەی چیرۆکی پڕ لە سۆزی مرۆیی، کە زیاتر جەخت لە لایەنی دەروونی و سۆز و بەزەیی ژیانی مرۆڤەکان دەکاتەوە.. جگە لەوەش، چیرۆکەکە پڕە لە دیمەن و ڕووداوی خێرا، جگە لە یەك هەڵوێست کە بواری بانگەوازی خوایی

گرتووەتەخۆ، کە دیمەنی زیندانەکەیە و یوسفیش خێرا ئەو هەڵوێستە دەقۆزێتەوە..

جا ئەو تاقە ئایەتەی سوورەتی (غافر) کە باسی پێغەمبەرایەتی یوسف دەکات، چەند شتێك ئاشکرا دەکات بۆمان، لەوانە:

١ـ یوسف وەك پێغەمبەر نێردراوە و پەیامی پێدانێردراوە (خاوەن پەیامە)، هەروەها ئەو نێردراوە بۆ میسرییەکان.

٢ـ ئەوان، واتە میسرییەکان، بە ڕاستیان نەزانیوە، بەڵام بە درۆشیان نەخستووەتەوە، بەڵکو "بەگومان بوون" لێی. (فِي شَكٍّ)..

٣ـ یوسف لە ناو میسرییەکاندا وەفاتی کردووە و مردووە.

٤ـ مردنەکەی، کاریگەریی قورسی لە سەر میسرییەکان هەبووە و پەشیمان بوون لەوەی کە مافی تەواویان بە یوسف نەداوە و حەقی خۆیان پێنەبەخشی تا مابوو لە ناویاندا..

بەڵام پرسیارەکە - هاوپەیوەست بەم بەشەی بابەتەکە، کە هەڵبژاردنی ڕووداوەکانە لە ناو چیرۆکدا - ئەوەیە، بۆ لە سوورەتی یوسف خۆیدا ئەم باسی پێغەمبەرایەتییەی نەخراوەتە چوارچێوەی چیرۆکەکەوە، ئەگەرچی وەك ڕووداوێکی لاوەکیش بووایە؟

لەوەلامدا دەڵێین: سەرەتا شوێنێکی گونجاو لە ناو سوورەتەکەدا بۆ باسکردنی ئەو بابەتە و ئاشکراکردنی بانگەوازی پێغەمبەرایەتیی یوسف (سەلامی خوای لێبێت)، دوو شوێنە:

یەکەم: ئەوکاتەی کە یوسف لە زیندان دێتەدەرەوە و پاشا پێی سەرسامە، کە چۆن خەون بە ڕێك و دروستیی لێکدەداتەوە و ڕەوشتی چەندە بەرزە و ڕووخساری چەندە دڵگیرە، ئەم کات و ساتە کاتێکی گونجاو بووە بۆ یوسف تا بانگەوازەکەی لەبەردەم پاشادا ئاشکرا بکات.

دووەم: ئەو ڕۆژەی کە یوسف خۆی لەسەر عەرش دانیشت و وتی: ﴿ رَبِّ قَدۡ ءَاتَيۡتَنِي مِنَ ٱلۡمُلۡكِ وَعَلَّمۡتَنِي مِن تَأۡوِيلِ ٱلۡأَحَادِيثِ ﴾، واتە: (ئەی پەروەردگاری من! تۆ دەسەڵات و فەرمانڕەواییت پێداوم، وە فێری خەون لێکدانەوەت کردووم).. ئەوکاتە یوسف پێگەی بەهێز بوو و گوێڕایەڵیی دەکرا.

سەبارەت بە خاڵی یەکەم، بێگومان پێش هاتنەدەرەوەی یوسف لە زیندان، هیچ ناگونجێت لەکاتێکدا ئەو لەناو بەڵا و موسیبەتدایە و لەناو تاقیکردنەوەیەکی گەورەدایە، تاقیکردنەوەیەکی دیکەشی بە سەردا بێت و بانگی پێغەمبەرایەتی ئاشکرا بکات... لە کاتی دەرچوونی لە زیندان و گەیشتنە بەردەمی پادشاشدا، کە پادشا بە "مكين أمين" ناوی دەبات، کێ دەزانێت ئەگەر لەو کاتەدا بانگی پێغەمبەرایەتی ئاشکرا بکات لەوانەیە چیرۆکەکە ئاڕاستەیەکی دیکەی بگرتایە و لەوانەیە پادشا بەو حاڵەتە ڕازی نەبوایە و بیگەڕاندایەتەوە بۆ زیندان، یان بکوژرایە، بەوەش هەلی بەردەم یوسف دەفەوتا کە بتوانێت جێپێی خۆی قایم بکات و دواتر پەیامەکە بگەیەنێت.. لەبەرئەوە ئەستەمە لەو کاتەدا

بیتوانیایە ئەو پەیامە ئاشكرا بكات، لەبەرئەوەشە قورئانیش باسی نەكردووە.

**سەبارەت بە خاڵی دووەم**، تا پێش دانیشتنی لەسەر عەرش، گومان لەوەدا نییە كە یوسف (سەلامی خوای لێبێت) بانگەوازی كردووە بۆ لای خوا و پەیامەكەی گەیاندووە، بەڵام لە لایەك سەردەمەكە، سەردەمی گرانی و بێبارانیی بووە، لەلایەكی دیكەشەوە، ڕووداوەكانی حەوت ساڵی یەكەمی خۆشگوزەرانیی پێش گرانییەكە، لابراوە و باس نەكراوە، هۆكاری باسنەكردنی ئەو حەوت ساڵە خۆشییەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ئەگەر باس بكرایە ئەوا سیاقی چیرۆكەكە دەقرتا و ڕووداوەكانی چیرۆكە ئەسڵییەكە، دەبڕدرا، لەبەرئەوە چیرۆكەكە ڕاستەوخۆ لە پاش دەرچوونی یوسف لە زیندان، دەگاتە سەر ڕووداوی لەوە گەرمتر و بەدوایەكداهاتوو، كە بە هاتنی براكانی بۆ میسر و نەناسینەوەی یوسف دەستپێدەكات، تا دەگاتە كۆتایی... ئیتر ناكرێت لێرەدا دیسانەوە چیرۆكەكە بقرتێنرێت و باسی بانگەوازی یوسف بكرێت، كە زیاتر وەك ئامانجێكی سەرەكیی چیرۆكەكە بە درێژایی چیرۆكەكە خۆی شاردووەتەوە.

سەبارەت بە دیمەنی كۆتایی چیرۆكەكەش، كە شادبوونەوەیەتی بە باوكی، كە چیرۆكەكە دەگاتە ترۆپكی خۆشی و كۆتاییەكی دڵخۆشكەر، ئەوا هیچ داناییەكی تێدا نییە دیسانەوە لێرەدا ڕەگەزێكی دیكەی ململانێ بهێنرێتە ناو باسەكە و بەوەش هەستی گوێگران بە سەرلەنوێ

تێهەڵچوونەوە بە بوارێکی دیکەدا تێکبچێت، لەبەرئەوە چیرۆکەکە بەو شێوەیەی ئێستای گونجاوترە بۆ گوێگر کە دەبینێت ئەنجامی ئارامگرتن و ڕازیبوون بە قەدەری خوا و متمانەبوون بە سەرخستن و پشتگیریکردنی بەندە دڵسۆزەکانی و ڕاستگۆیی و کارکردن و تەمەڵی نەکردن، چۆن بە خۆشی و دڵخۆشی و بە دیدار شادبوونەوە، کۆتایی دێت..

کەواتە بە هیچ جۆرێك چیرۆکی یوسف لە سوورەتەکەی خۆیدا، گونجاو نەبووە بۆ باسکردنی باسوخواسی پێغەمبەرایەتییەکەی، **پاشان با بێین پرسیارەکە بە شێوەیەکی دیکە بکەین: ئایا بۆچی ئەو تاقە ئایەتەی باسی پێغەمبەرایەتی یوسف دەکات، لە سوورەتی غافر و لە ناو چیرۆکی مووسادا باسکراوە؟**

لە وەڵامدا دەڵێین: ئەو چیرۆکەی تر، کە ئایەتەکەی سوورەتی غافری تێدا هاتووە، چیرۆکێکە پاش یوسف بە چەندین ساڵ ڕوویداوە، بەڵام لە هەمان ئەو شوێنەی کە یوسف تیایدا ژیا و لە هەمان ئەو کۆشك و باڵاخانانەی کە یوسف سەردەمی خۆی تیایدا کاری دەکرد، هەروەها لە هەڵوێستێکدا کە ململانێ تیایدا لە لوتکەدایە، ململانێی بانگخوازان لەگەڵ ئەوانەی بە درۆیان دەزانن و باوەڕیان پێناکەن، دیمەنەکە باس لە ململانێیەك دەکات کە هاتوهاواری فیرعەون و شوێنکەوتووانی بەرز بووەتەوە، کە هەڕەشە دەکەن لە مووسا و هاروون: دوو پەیامبەری خوا، کە دەبێت بیانکوژین و شوێنکەوتووانیشیان بکەین بە بەندە و

کۆیله و کوڕەکانیان بکوژین و کچەکانیان بکەین بە کەنیزەك، ئا لێرەدا دەنگی عەقلّ و ژیریی لە پیاوێکی خزمی فیرعەون خۆیەوە بەرز دەبێتەوە و دێتەدەر، پیاوێك کە باوەڕی خۆی شاردووەتەوە و ئاشکرای نەکردووە، قسەکەی وەك ئەنجامی بیرکردنەوەیەکی لۆژیکیی دەردەکەوێت، نەك ئەنجامی باوەڕهێنان، ئەمەش کاریگەریی زیاتری لەسەر بێباوەڕان هەیە، لەبەرئەوەی ئەگەر دەنگی باوەڕ و ئیمان کاریگەریی زیاتری هەبوایە لە دەنگی عەقلّ و ژیریی، ئەوا مووسا لە هەموو کەس زیاتر شایانی ئەوە بووە باوەڕی پێبهێنرێت و شوێنی بکەون، نەك هەوڵی کوشتن و دەربەدەرکردنی بدەن..

پیاوە ئیماندارەکەی خزمی فیرعەون بە فیرعەون و دەوروبەرەکەی دەڵێت: ﴿وَإِن يَكُ كَٰذِبًا فَعَلَيۡهِ كَذِبُهُۥۖ وَإِن يَكُ صَادِقًا يُصِبۡكُم بَعۡضُ ٱلَّذِي يَعِدُكُمۡ﴾ (غافر: ٢٨) واتە: (مووسا ئەگەر درۆ بکات، درۆزنییەکەی بە زیانی خۆی تەواو دەبێت، ئەگەر ڕاستگۆش بێت هەندێك لەو بەڵایانەتان بەسەردێت کە بەڵێنی پێداون)، پاشان پیاوەکە دەیانترسێنێت بەوەی کە تووشی ئەوە دەبن کە مووسا بەڵێنی پێداون و نموونەی گەلانی پێش خۆیانیان بۆ دەهێنێتەوە، دواتر یوسفیان بیردەخاتەوە کە چۆن گومانیان لە بانگەوازەکەی هەبوو و دواتر کە یوسف وەفات دەکات پەشیمان بوون لەو هەڵوێستەیان لە بارەی یوسفەوە.. دواتر قسەکانی لە بارەی یوسفەوە بەوە کۆتایی پێدێنێت

که هەڵوێستی ئێستایان بەرانبەر بە مووسا هاوشێوەی ئەو هەڵوێستەی باوباپیریانە بەرانبەر بە یوسف...

بە گەڕانەوە بۆ سەرەتای بابەتەکە، کە هەڵبژاردنی ڕووداوەکانە لە ناو چیرۆکدا، دەبینین کە چۆن ئەم شوێنە، گونجاوە بۆ ئەو ئایەتەی کە باس لە پێغەمبەرایەتی یوسف دەکات و هۆکاری ئەوەش ڕوون بوویەوە کە بۆچی لە چیرۆکەکەی خۆیدا باسی نەکراوە، بەوەش دەردەکەوێت کە: خاسیەتی هەڵبژاردنی ڕووداو لە ناو چیرۆکە قورئانییەکاندا، ترۆپکی باڵایە کە هەموو ئەدیب و نووسەران ئاواتیان ئەوەیە بگەنە بەشێکی ئەو ترۆپکە قورئانییە، لە ڕووی وردیی و جوانی و ڕەوانبێژیی و ئیعجازەکەیەوە...

# بەشی سێهەم

# دووبارەکردنەوەی چیرۆك لە قورئاندا

کاتێك لە چیرۆکە قورئانییەکان ورد دەبینەوە، دەبینین چیرۆك هەیە لە چەندین سوورەتدا باسکراوە، یان دەتوانین بڵێین لە چەند شوێنێکی قورئاندا دووبارەکراوەتەوە (لەگەڵ بوونی سەرنجمان لەسەر وشەی دووبارەکردنەوە)، بەڵام ئەم دووبارەکردنەوەیە، هەرگیز ئەو دووبارەکردنەوەیە نییە کە لە بیری هەر یەکێك لە ئێمەدا هەیە، واتە دووبارەکردنەوەیەك نییە کە مرۆڤ پێ بیبێزار بێت، لەبەرئەوەی هاتنی هەر چیرۆکێك لە سوورەتێکدا، بەشێك لەو چیرۆکە لەو سوورەتەدا باسکراوە کە لەگەڵ ئامانجی سەرەکیی سوورەتەکەدا بگونجێت، هەروەها لە کۆتاییشدا لەگەڵ ئامانجە سەرەکییەکانی هاتنی قورئاندا یەکانگیر دەبێتەوە، کە لە دەستپێکی ئەم کتێبەدا باسمان کرد.. جا جیاوازیی قورئان لەگەڵ پەخشان و ڕۆمان و چیرۆکی دیکەدا دوو شتە:

**یەکەم**: ئەوەی کە قورئان وتەی خوایە، وتەی مرۆڤ نییە، ئەگەرچی بە شێوەی زمانی مرۆڤەکان ـ زمانی عەرەبی ـ دابەزیبێت و هەمان ئەو شێوازانەی قسەکردنی بەکارهێنابێت کە مرۆڤەکان بەکاریدەهێنن، بەڵام قسەکەر مرۆڤ نییە، بەڵکو پەروەردگاری بەرز و بڵندە، کە لایەنی

سەرەکی و بنەڕەتییە لە پرۆسەی قسەکردن و لێکتێگەیشتنەکەدا..
واتە لێرەدا سێ شت بوونیان هەیە: قسەکەر، قسەبۆکراو، ئەو پەیام و مەسجەی کە نێردراوە.. کاراکتەری سەرەکیی قسەکەر لە قورئاندا: خوای پەروەردگارە و ئەمەش گرنگترینیانە.

**دووەم:** لەبارەی ئەرکی نووسراوەکانی، وەك پەخشان و ڕۆمان لە لایەك و قورئان لە لایەکی دیکە، دەبینین ئەرکی قورئان ئەوە نییە کە کتێبێکی فەلسەفی بێت، ئەگەر خوێنەر بێزار بوو لێی، لای بدات، یان کتێبێکی چیرۆکخوانی و حیکایەت بێت، ئەگەر حەزی لێکرد بیخوێنێتەوە و ئەگەر بێزار بوو لێی، فرێی بدات، بەڵکو قورئان کتێبێکە لە ئاسمانەوە هاتووە و هەڵگری بەڵگەی ڕاستێتیی پێغەمبەرایەتی محەممەدە (دروود ی خوای لێبێت)، کاتێك شوێنکەوتووانی باوەڕ بە قورئان دەکەن، ئەوکات دەیکەنە دەستوور و بنەمای کارکردنیان، جا ئایا ـ کە ئەمە خاڵە گرنگەکەیە ـ دەگونجێت کتێبێك ئەم ئەرکە گرانەی پێبێت، یەکجار ڕاستی و حەقیقەتت نیشان بدات و بڕوات بە سەریدا، بەتایبەتی کە گیانی سەرکێشی و باوەڕنەکردن و بەدرۆخستنەوە و گومان لای مرۆڤەکان بوونی هەیە، ئایا نابێت چەند جارێك و لە چەند شوێنێکی ئەو کتێبەدا باس لەو حەقیقەتانە بکرێتەوە، تا ئەگەر کۆمەڵێك لە یەکەمجاردا باوەڕیان نەهێنا، بتوانن لە دووەمجار و سێهەمجار و چوارەمجاردا کە حەقیقەتەکە لە بەرگێکی دیکە و شێوازێکی دیکەدا درایەوە بە گوێیاندا، باوەڕ بکەن.. بەتایبەتیتریش کە

قورئان فەرمان دەكات بە باوەڕبوون بە چەندین كاراكتـەر و حەقیقـەتی پەنهان و نادیار و غەیبی، كە لە چوارچێوەی هەستەوەرەكانی مرۆڤـدا جێیان نابێتەوە و نابینرێن.. ئەگەر كەسێك بڕوات بە لای كۆمەڵێكدا كە خـەریكی بتپەرسـتین، ئایـا هـەر ئەوەنـدە بـەس دەبێـت كـە یـەكجار پێیانبڵێت وازبهێنن لە بتپەرستی، ئـیتر كـابرا بـڕوات و لێیـان دووبـارە نەكاتـــەوە؟! بێگومـــان نـــەخێر.. دەی ئەمـــە، هۆكـــاری ســـەرەكیی دووبارەكردنەوەیە لە قورئاندا بـە گشـتی و لـە چـیرۆكە قورئانییەكانـدا بەتایبەتی..

**قورئان مەبەستێكی سەرەكیی هەیە، كە لە سەرەتای ئەم كتێبەدا ئاماژەمان بۆ كرد، قورئـان لـە هـەموو سـوورەتێكدا دووبـارەی ئـەم مەبەستە سەرەكییەی كردووەتەوە، جار لەدوای جار و بە شێوازگەلی جۆربەجۆر ئەم ڕاستییەی وتووەتەوە، بۆ نموونـە زۆر لـە سـوورەتە درێژەكانی قورئان لە سەرەتاكانیدا ئەوە وەبیر دێنێتەوە كە ئەمانە، ئایەتی قورئانن، ڕاسـتن، خوا ناردوونی، هەروەها ئەمە قورئانە، ئەی محەممەد، ئەی شوێنكەوتووانی، ئەی خـەڵكی.. دەی ئایا دەكرێـت یەكجار لە سەرەتای قورئاندا ئەمە بڵێـت و ئـیتر بەسـەریدا بـڕوات و دووبارەی نەكاتەوە؟!**

جـا چـیرۆكە قورئانییـەكانیش بەهەمانشـێوە، تـەرخانكراون بـۆ خزمەتكردن بە بەدیهێنانی ئەو مەبەستەی كە قورئـانی بـۆ نێردراوەتـە خوارەوە، بەپێی پێویستیی ئـەو خزمەتـە، چـیرۆكەكەش دەگۆڕدرێـت،

سیاق و پێویستیی هێنانی چیرۆکێك لە شوێنێکدا وادەکات کار بەو پرەنسیپە بکرێت کە لە بەشی پێشوودا باسمان کرد، کە بریتییە لە "هەڵبژاردن"ی ڕووداو بەپێی مەبەستی ئەو سوورەتەی کە چیرۆکەکەی تێدا باس دەکرێت، جا هەندێکجار چیرۆکەکە بە تەواویی دەهێنرێت، لە هەندێك شوێنی دیکەدا وەك "نموونە" ﴿ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا ﴾ دەهێنرێت، جاری وا هەیە وەك هەواڵێك ﴿ وَفِرْعَوْنَ ذِى ٱلْأَوْتَادِ ﴾ دەهێنرێت، یان بەشێکی کەمی لێ باسدەکرێت، تەنها بۆ ئەوەی ئەو مەبەستەی لەو شوێنەی سوورەتەکەدا هەیە، بیپێکێت، لەبەرئەوە بە شێوەیەکی گشتی دەتوانرێت بوترێت: زۆرینەی ئەو چیرۆکانەی قورئان کە هاتوون لە قورئاندا "دووبارە" نین، بەڵکو "تەواوکەر"ن..

هەندێك لە چیرۆکەکانی قورئان دووبارەکراوەتەوە بە مەبەستی تەواوکردنی چیرۆکەکە، وەك چیرۆکی ئادەم و چیرۆکی نووح و ئیبراهیم و مووسا (سەلامی خوایان لێبێت)، هەندێك چیرۆکی دیکە، چیرۆکی تەواون، یان نیمچە تەواون، وەك چیرۆکی یوسف.

## چیرۆکی دروستکردنی ئادەم، بە نموونە:

یــەکێك لــەو چــیرۆکانەی قورئــان کــە لــە چــەند شــوێنێکدا دووبارەکراوەتەوە، چیرۆکی خەڵقی ئادەمە (سەلامی خوای لێبێت)، کە هەر جارەی بۆ مەبەستێك لـە سوورەتێکدا باسکراوە، سـەرەتا بـەپێی ڕیزبەندیی هاتنەخوارەوەی سوورەتەکان بەمجۆرە باسکراوە: یەکەمجار لە سوورەتی (ص)دا، بە دوایدا لە سوورەتی ئەعراف و پاشـان (طـه) و پاشـان (اسـراء) دواتـر (حجـر) و دواتـر (کهـف) و دواهـەمین جـاریش سوورەتی (البقرة)، هۆکاری باسکردنیشی بەمجۆرەیە:

١ـ یەکەمین جار هێنانی چیرۆکی خەڵقی ئادەم لە میانەی باسـکردنی ڕاستێتی پێغەمبەرایەتی محەممەد (دروود ی خوای لێبێت) هاتووە، کـە محەممـەدی نەخوێنـدەوار لـە نـاو عەرەبـدا هـاتووە و لـە منداڵییـەوە دەیناسـن، ئـیتر چـۆن دەتوانێـت هـەواڵی ڕووداوەکـانی ئاسمـان پـێش خەڵقی ئادەم و دوای خەڵقی ئادەم بزانێت، ئەگەر خوا ئاگاداری نەکات، سـەیری ئـەم نموونانـە بکـە لـەو بـارەوە: ﴿ مَا كَانَ لِيَ مِنْ عِلْمٍ بِالْمَلَإِ الْأَعْلَىٰ إِذْ يَخْتَصِمُونَ ﴿٦٩﴾ إِن يُوحَىٰ إِلَيَّ إِلَّا أَنَّمَا أَنَا نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٧٠﴾ إِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَائِكَةِ إِنِّي خَالِقٌ بَشَرًا مِّن طِينٍ ﴿٧١﴾ ﴾ (ص: ٦٩ – ٧١) واتــە: (خــۆ مــن ـ مــەبــەســت پێغەمبەرە ـ هیچ ئاگاداری ئەوە نەبووم کە چی گوزەراوە لە باڵانشینان (فریشتە پایە بڵندانی ئاسمان) کاتێك کە فریشتەکان کێشەیان هەبوو لە جێنشینی ئادەمدا. وەحی و نیگام بۆ نایەت تەنها لەبەرئەوە نەبێت کـە

من بێدارکەرەوەیەکی ئاشکرام. کێشەی فریشتەکان کاتێك بوو کە پەروەردگارت پێیوتن: من دەمەوێت بەشەرێك، لە قوڕ دروست بکەم)...

کەواتە باسکردنی چیرۆکی ئادەم بەڵگەیە لەسەر پێغەمبەرایەتی ئەو سەروەرە.. جا لەوە گرنگتر ئەوەیە، کە ئەگەر ئەم ئیعجاز و بەڵگەهێنانەوەیە بۆ ئەو کاتەی خەڵکی مەککە بوو بێت، ئەوا چیرۆکەکە ئەوەی لەبیر نەکردووە کە ئەم بەڵگەهێنانەوەیە بە خەڵقی ئادەم، بۆ خەڵکی زەمان و سەردەمەکانی دواتریش ببێت و بگونجێت، لەبەرئەوە چیرۆکەکەی بە ئایەتێکی زۆر گرنگ - هەموو ئایەتەکانی قورئان گرنگن - کۆتایی پێهێناوە: ﴿ وَلَتَعْلَمُنَّ نَبَأَهُۥ بَعْدَ حِينِۭ ﴾ (ص: ٨٨) واتە: (بەڕاستی لە داهاتوویەکی نزیکدا، هەر لە دنیادا هەواڵی ڕاستی و دروستی ئەم ئایینە دەزانن)..

٢ـ جارێك چیرۆکەکە لە میانەی باسکردنی توانا و قودرەتی خوای گەورەدا، باسکراوە: ﴿ وَلَقَدْ مَكَّنَّٰكُمْ فِي ٱلْأَرْضِ وَجَعَلْنَا لَكُمْ فِيهَا مَعَٰيِشَۗ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ﴿١٠﴾ وَلَقَدْ خَلَقْنَٰكُمْ ثُمَّ صَوَّرْنَٰكُمْ ثُمَّ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِأٓدَمَ ﴾ (الأعراف: ١٠ – ١١) واتە: (بە ڕاستی ئێمە ئێوەمان نیشتەجێکرد لەم زەویەدا و دەسەڵاتمان پێبەخشین و جۆرەها هۆکاری ژیانمان تیایدا بۆ سازاندوون (لە خواردن و خواردنەوە و هۆکانی گواستنەوە و پۆشاك و ناوماڵ و ئاوو هەواو... هتد)، کەچی سوپاسی کەمی نیعمەتەکان دەکەن یان کەمتان سوپاسگوزارن. بە ڕاستی ئێمە

(باوه گەورەی) ئێوەمان دروست کرد و نەخش و نیگاری ڕواڵەت و ڕوخساری ئێوەمان کێشا، پاشان وتمان بە فریشتەکان: ئادەی سوژدە بەرن بۆ ئادەم)، بەهەمانشێوە، باسی توانای خوایە لە پێدانی هێز بە مرۆڤەکان، تا لەسەر زەوی بژین وەك چۆن پێشتر ئادەمی دروستکرد و بە فریشتەکانی فەرموو کڕنووشی بۆ ببەن....

یـــاخود ﴿ وَإِنَّا لَنَحْنُ نُحْيِۦ وَنُمِيتُ وَنَحْنُ ٱلْوَٰرِثُونَ ﴿٢٣﴾ وَلَقَدْ عَلِمْنَا ٱلْمُسْتَقْدِمِينَ مِنكُمْ وَلَقَدْ عَلِمْنَا ٱلْمُسْتَـْٔخِرِينَ ﴿٢٤﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ هُوَ يَحْشُرُهُمْ إِنَّهُۥ حَكِيمٌ عَلِيمٌ ﴿٢٥﴾ وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن صَلْصَٰلٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ ﴿٢٦﴾ ﴾ (الحجر: ٢٣ - ٢٦)، واتـە: (بـە ڕاسـتی هەر ئێمە ژیان دەبەخشین و مردنیش پێشدەهێنین، سەرئەنجام هەر ئێمەش خاوەنی هەموو جیهانین. سوێند بە خوا، بێگومان ئێمە ئاگادارین لە پێشینانی ئێوە، هەروەها ئاگادارین لە نەوەکانی داهاتوویش. بە ڕاستی پەروەردگاری تۆ هەر خۆی هەموان کۆدەکاتەوە و بێگومان هەر ئەو زاتە دانا و زانایە. سوێند بە خوا، ئێمە سەرەتا ئینسانمان لە قوڕێکی وشك دروست کرد، کە پێشتر قوڕێکی ڕەشباو و ترشاو بوو)، بەهەمانشێوە باس لە قودرەت و توانای خوایە لە زیندووکردنەوە و ژیان و مردنی مەخلوقات لە سەرەتا و کۆتاییدا وەك چۆن مرۆڤی لە بنەڕەتدا دروستکردووە و بە فریشتەکانی فەرموو کڕنووش بۆ یەکەم مرۆڤ ببەن.

٣ـ هەندێکجار چیرۆکەکە لە میانەی باسکردن لە مرۆڤ، کە چۆن ناز و نیعمەتەکانی خوای بیر دەچێت، چۆن بیری دەچێت خوا مرۆڤی

هەڵبـژاردووە بەسـەر سـەرجەم مەخلوقاتـەکانی دیکـەدا، چـۆن بـیری دەچێت کە خوا ئەوی کردووەتە جێنشین بـۆ ئاوەدانکردنـەوەی زەوی، لەو کاتەدا بابەتەکە دەبەستێتەوە بەوەی کە کاتی خۆیشی ئادەم خـوا خەڵقی کرد و بە فریشتەکانی فەرموو کڕنووشی بۆ ببـەن، دواتـر ئـادەم بیری چوو... واتە بابەتی بیرچوونەوەکە خاڵی کۆکەرەوەی چیرۆکەکەیە لەگـەڵ سـیاقی سـوورەتەکەدا: ﴿ وَكَذَٰلِكَ أَنزَلْنَٰهُ قُرْءَانًا عَرَبِيًّا وَصَرَّفْنَا فِيهِ مِنَ ٱلْوَعِيدِ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ أَوْ يُحْدِثُ لَهُمْ ذِكْرًا ﴿١١٣﴾ فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ ٱلْمَلِكُ ٱلْحَقُّ ۗ وَلَا تَعْجَلْ بِٱلْقُرْءَانِ مِن قَبْلِ أَن يُقْضَىٰٓ إِلَيْكَ وَحْيُهُۥ ۖ وَقُل رَّبِّ زِدْنِى عِلْمًا ﴿١١٤﴾ وَلَقَدْ عَهِدْنَآ إِلَىٰٓ ءَادَمَ مِن قَبْلُ فَنَسِىَ وَلَمْ نَجِدْ لَهُۥ عَزْمًا ﴿١١٥﴾ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰ ﴾ (سـوورەتی طـە: ١١٣ـ ١١٦) واتـە: (ئـا بـەو شێوەیە ئێمە قورئـانێکی عـەرەبی و پـاراو و ڕەوانمـان دابـەزانـدووە و جۆرەها هەڕەشەشمان تیادا باس کردووە، بۆ ئـەوەی لـە خـوا بترسـن، یاخود ببێتە هـۆی ئـەوەی کـە یـاداوەرییـان تێـدا بـەدیبهێنێـت. خـوای گەورە زۆر پایەبەرز و بڵندە و پاشای بە حەق و ڕاستەقینـەیـە، (ئـەی محەمەد) نەکەیت لە خوێندنی قورئاندا پەلە بکـەیـت: لـە پـێش ئـەوەی وەحی و نیگای ئەو قورئانە تەواو ببێت بۆ لای تۆ (چونکە ئێمە نایەڵین فەرامۆشی بکەیت)، نزا بکە و بشڵێ: پەروەردگارا، بـەردەوام زانسـت و زانیاری زۆرتر و زیاترم پێببەخشە. بێگومان ئێمە پێشتر پەیمانمـان لـە ئادەم وەرگرت، کەچی بیری چوو، بە مەرجێك نەمانبینی پێشتر بڕیاری کردنی ئەو سەرپێچییە بدات. سەردەمێك بە فریشتەکانمان وت: سوژدە

بەرن بۆ ئادەم، هەموو سوژدەیان برد، جگە لە ئیبلیس کە سەرسەخت و یاخیی بوو...)، تا کۆتایی چیرۆکەکە لە سوورەتی (طـه).. تەنانـەت لەوەش گرنگتر ـ کە ئایەتەکانی قورئان هـەمووی گـرنگن ـ بەستنەوەی کۆتـایی سـوورەتەکەیە بـە بابـەتی بیرچـوونەوەوە، کـە دەفـەرموێت:

﴿ قَالَ رَبِّ لِمَ حَشَرْتَنِيٓ أَعْمَىٰ وَقَدْ كُنتُ بَصِيرٗا ١٢٥ قَالَ كَذَٰلِكَ أَتَتْكَ ءَايَٰتُنَا فَنَسِيتَهَاۖ وَكَذَٰلِكَ ٱلْيَوْمَ تُنسَىٰ ١٢٦ ﴾ (طـه: ١٢٥ـ ١٢٦) واتـه: (دەڵێـت: ئـەی پەروەردگار، بۆ بە کوێریی حەشرت کردم، خۆ من کاتی خـۆی چاوساغ و بینا بووم، دەفەرموێت: تۆ ئا بەو شێوەیە بوویـت (کـوێر بوویـت) لـە ئاستی ئایەت و بەڵگەکانی ئێمەدا کاتێك پێتـڕادەگەیەنرا، ئێمەش ئەمڕۆ ئاوا مامەڵەی کەسێکی لە بیرکراوت لەگەڵدا دەکەین).

٤ـ هەندێکجار چیرۆکی خەڵقی ئادەم لەمیانەی باسێکدا هـاتووە، کـە بێباوەڕان گاڵتەیان بە پێغەمبەری خوا کردووە (درووود ی خوای لێبێت)، کە باسی چارەنووسی بێباوەڕانی کردووە، گاڵتەیان بە بوونی درەختێك کردووە لە ناو دۆزەخدا، کە چۆن درەخت بوونی هەیە لـە نـاو ئـاگردا و ناشسووتێت، چیرۆکەکە لەو کاتەدا هێنراوە بۆ ئـەوەی بفـەرموێت ئـەم گاڵتەکردنـەی ئـەوان، وەك گاڵتـەکردنی ئیبلیسـە بـە ئـادەم، کـە ئامادەنەبوو کڕنووشی بۆ ببات، لەبەرئەوەی ئەو لـە قـوڕ و ئـەمیش لـە ئاگر دروسـتکراوە، واتـە قیاسـی هـەردوو گاڵتەکردنەکـەی لەسـەر یـەك کردووە، بە هێنانی چیرۆکی خەڵقی ئادەم لە ناو ئەو باسەدا، ئەمەش لە سـوورەتی (الاسـراء)دا: ﴿ وَإِذْ قُلْنَا لَكَ إِنَّ رَبَّكَ أَحَاطَ بِٱلنَّاسِۚ وَمَا جَعَلْنَا ٱلرُّءْيَا

ٱلَّتِيٓ أَرَيۡنَٰكَ إِلَّا فِتۡنَةٗ لِّلنَّاسِ وَٱلشَّجَرَةَ ٱلۡمَلۡعُونَةَ فِي ٱلۡقُرۡءَانِۚ وَنُخَوِّفُهُمۡ فَمَا يَزِيدُهُمۡ إِلَّا طُغۡيَٰنٗا كَبِيرٗا ﴿٦٠﴾ وَإِذۡ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ قَالَ ءَأَسۡجُدُ لِمَنۡ خَلَقۡتَ طِينٗا ﴿٦١﴾ ﴾ (الإسراء: ٦٠ – ٦١) واته: (ئەی محەمەد، یادی ئەوە بکە کاتێك پێمانووتی بە ڕاستی پەروەردگاری تۆ دەوری خەڵکی داوە و ئاگادارە بە هەموو شتێکیان. ئەو شتانەش کە لە خەوندا نیشانمان دایت، تەنها تاقیکردنەوە بوو بۆ خەڵکی، هەروەها بە باسی درەختە نەفرینلێکراوەکەش کە لە قورئاندا ناوبراوە، تاقییاندەکەینەوە. ئێمە دەمانەوێت بەم باسانە بیانترسێنین، کەچی ئەو باسانە هیچیان بۆ زیاد ناکات تەنها لادان و یاخیبوونێکی گەورە نەبێت. کاتێك بە فریشتەکانمان وت: ئادەی سوژدە بەرن بۆ ئادەم، هەموو سوژدەیان برد جگە لە ئیبلیس، وتی: ئایا چۆن سوژدە دەبەم بۆ ئەو کەسەی کە لە قوڕ دروستتکردووە؟). جا لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە، ئەم گاڵتەکردنەش بەستراوەتەوە بە گاڵتەکردنیان بە ڕووداوی ئیسرا و میعراج، کە سوورەتەکە لە سەرەتادا باسی کردووە، جا بەم باسەی ئادەم، جەختی لەسەر ئەوەش کردووەتەوە.

٥ــ لە شوێنێکی دیکەدا، چیرۆکی خەڵقی ئادەم لە میانەی بەڵگەهێنانەوە لەسەر ڕاستێتی زیندووبوونەوە و ڕۆژی دوایی هاتووە، کە چۆن خوای گەورە یەکەمجار مرۆڤی دروستکردووە، ئاواش توانای هەیە جارێکی دیکە زیندوویان بکاتەوە: ﴿ لَّقَدۡ جِئۡتُمُونَا كَمَا خَلَقۡنَٰكُمۡ أَوَّلَ

مَرَّةٍۭ بَلۡ زَعَمۡتُمۡ أَلَّن نَّجۡعَلَ لَكُم مَّوۡعِدٗا ﴿٤٨﴾ ﴾ (الكهف: ٤٨) واتە: (سوێند بێت، وا هاتنەوە بۆ لامان هەروەك لە سەرەتادا دروستمانكردوون، لە حاڵێكدا كە ئێوە گومانتان وابوو، واشتاندەوت كە هەرگیز كاتێكمان دیارینەكردووە بۆ لێپرسینەوەتان)، هەروەها دەمكوتكردنی شوێنكەوتووانی ئیبلیس و بێدەنگكردنیان، كە چۆن شوێن ئیبلیسێك دەكەون كە كاتی خۆی ئەمە بەسەرهاتەكەیەتی لەگەڵ ئادەمی باوكتاندا: ﴿ وَإِذۡ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ كَانَ مِنَ ٱلۡجِنِّ فَفَسَقَ عَنۡ أَمۡرِ رَبِّهِۦٓۗ أَفَتَتَّخِذُونَهُۥ وَذُرِّيَّتَهُۥٓ أَوۡلِيَآءَ مِن دُونِي وَهُمۡ لَكُمۡ عَدُوُّۢۚ بِئۡسَ لِلظَّٰلِمِينَ بَدَلٗا ﴿٥٠﴾ ﴾ (الكهف: ٥٠) واتە: (ئێمە كاتێك بە فریشتەكانمان وت سوژدەبەرن بۆ ئادەم، هەر هەموو سوژدەیان برد جگە لە ئیبلیس، كە لە دەستەی پەرییەكان بوو، بە هۆی ئەوەوە لە فەرمانی پەروەردگاری یاخیی بوو، ئایا ڕەوایە كە ئەو و نەوەكەی بكەنە پاڵپشت و یارویاوەری خۆتان لە جیاتی من، لە حاڵێكدا ئەوان دوژمنی هەمیشەیی ئێوەن، ئای كە چەندە كارێكی خراپ و ناڕەوایە بۆ ستەمكاران، كە لەجیاتی خوا، دوژمنێكی وەك شەیتانیان داناوە و گوێڕایەڵی دەكەن).

٦ـ دواهەمین جار لە قورئاندا كە باسی چیرۆكەكە كرا بێت، لە سوورەتی (البقرة)دایە و دیسانەوە لە میانەی باسكردنی توانا و قودرەت و فەزڵی پەروەردگاردایە، بەڵام ئاڕاستەی قسەكان ڕووەو

ئیماندارانه، نـەك بێبـاوەڕانی مەككـە، لەبەرئـەوەی سـوورەتی (البقـرة) سوورەتێكی مەدینەییە (لە كۆتایی ئەم باسـەدا سـەرنجێك لـەو بـارەوە دەخەینـەڕوو)، دیقـەت بفـەرموون: ﴿ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ لَكُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ فَسَوَّىٰهُنَّ سَبْعَ سَمَـٰوَٰتٍ ۚ وَهُوَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿٢٩﴾ وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَـٰٓئِكَةِ إِنِّى جَاعِلٌ فِى ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً ﴾ (البقـرة:٢٩ــ٣٠) واتە: (هەر ئەو زاتە هەموو شتێكی لە زەویدا بـۆ ئێـوە دروسـتكردووە، پاشـان ویسـتی ئاسمـان دروسـتبكات، بـە حـەوت چـین بـەدیهێنـا و ڕێكیخستن، هەر خۆیشی بە هەموو شتێك زانا و ئاگادارە. پەروەردگارت بە فریشتەكـانی وت: بـە ڕاسـتی مـن دەمـەوێـت لـە زەویـدا جێنشـینێك دابنێم)، لێرەدا چیرۆكەكە لە كـاتی باسـكردنی توانـای پـەروەردگار لـە دروستكردنی ئاسمانـەكان و زەویـدا هـاتووە و تێهەڵكێشـی باسـی ئـەو توانایە كراوە لە دروستكردنی ئادەمیشدا.

بەمجۆرە، دیقەت دەدەین و ورد دەبینەوە، ئـەم هـەموو شـوێنانەی كە تیایدا باس لـە خـەڵقی ئـادەم و ململانێـی لەگـەڵ ئیبلیسـدا كـراوە، هەرجارەی بە شێوەیەك باسـی كـردووە، كـە جیـاواز بێـت لـە شـێوەی باسـكردنی لـە سـوورەتێكی دیكـەدا، جیاوازییەكـە لـەم ڕووانەوەیـە: "ڕووداوەكـانی نـاو چـیرۆكەكە و قـەبارەی باسـكردنی و شـێوازەكەی و ڕێگـای خسـتنەڕووی و تیشـك خستنەسـەر كـارێكی دیـاریكراوی نـاو چیرۆكەكە، لەبەر ئەو كارەیە كە چیرۆكەكە هێنراوە".. بەمەش جەخت لەوە دەكاتەوە كە: دووبارەكردنەوە لە قورئاندا، ئەركێكی دیـاریكراوی

هەیە و ئامانجێکی مەبەستداری هەیە و بۆ مەبەستی کاتکوشتن و کاتبەسەربردن، نەهێنراوە...

**تێبینییەکی گرنگ:** بۆ توێژینەوە و وردبوونەوە و دیراسەکردنی بابەتی دووبارەکردنەوەی چیرۆکە قورئانییەکان، زۆر گرنگە سەرەتا ڕیزبەندیی هاتنەخوارەوەی سوورەتەکانی قورئان بزانین، تا وردەکاریی لەدوایەکهاتنی چیرۆکێك بە تەواویی ڕوون ببێتەوە لای توێژەر، یان خوێنەر، تا بزانرێت چیرۆکێك سەرەتا لە کام سوورەتەدا دابەزیوە و ئایا بە درێژیی باسکراوە یان بە پوختی و پاشان لە چ سوورەتێکی دواتریدا درێژەکەی یان پوختەکەی باسکراوەتەوە..

### سێ سەرنجی گرنگ لە بارەی چیرۆکی ئادەم و ئیبلیس:

**یەکەم:** زۆرینەی چیرۆکە قورئانییەکان لە سوورەتە مەککەییەکاندا (ئەو سوورەتانەی کە لە مەککە و پێش کۆچکردن بۆ مەدینە دابەزیون) بە تەواوەتی باسکراون و لە سوورەتە مەدەنییەکاندا (ئەو سوورەتانەن کە لە مەدینە و پاش کۆچکردن بۆ ئەو شارە دابەزیون) زۆر بە کورتی ئاماژەیان پێدراوەتەوە.. جگە لە چیرۆکی خەڵقی ئادەم، ئەم چیرۆکە بە تەواوەتی لە سوورەتی (البقرة)دا (لە ئایەتی ٢٩ تا ٣٩) بە درێژیی باسیکراوە، کە سوورەتێکی مەدەنییە و دواهەمین جاریشە کە قورئان باسی لەو چیرۆکە کردبێت..

به دەربڕینێکی دیکە، چیرۆکی خەڵقی ئادەم ـ وەك وتمان ـ لە حەوت شوێنی قورئاندا باسکراوە، کە بەپێی زنجیرەی هاتنەخوارەوەی قورئان بەمشێوەیەیە: یەکەمجار لە سوورەتی (ص)دا باسکراوە، بە دوایدا لە سوورەتی (الأعراف)، پاشان (طه)، پاشان (الإسراء)، پاشان (الحجر)، پاشان (الكهف)، پاشان (البقرة).. ئەو شەش سوورەتەی کە یەکەمجار باسی چیرۆکەکەی کردووە، هەموویان مەککیین، بەڵام دواهەمین جار کە باسی چیرۆکەکە کرابێت لە سوورەتی (البقرة)دایە کە سوورەتەکە مەدەنییە و چیرۆکەکەش لێرەدا بە تێروتەسەلی باسکراوە، نەك لە سوورەتە مەککییەکاندا.. بەڵکو لە سوورەتە مەککییەکاندا تەنها "ئاماژە" بە چیرۆکەکە کراوە، نەك وردەکارییەکەی.

**دووەم**: کاتێك لە سوورەتی (ص) ورد دەبینەوە، کە یەکەم سوورەتە لە قورئاندا لە کاتی دابەزینیدا باسی لە چیرۆکی ئادەم و ئیبلیس کردووە، واتە کاتێك دابەزیوە کەس هیچی نەزانیوە لە بارەی ئەو چیرۆکەوە، لەو سوورەتەدا تەنها "ئاماژە"ی بۆ چیرۆکی ئادەم کردووە، نەك "وردەکارییەکەی"، بە ئاماژە باسی لەو وتووێژە ئاسمانییە کردووە کە هێشتا باسوخواسی دانەبەزیوەتە سەر زەوی، خوا فەرمان بە پێغەمبەر دەکات (درورد ی خوای لێبێت) کە وەڵامی ئەو کەسانە بداتەوە کە لە ئایندەدا پرسیاری لێدەکەن و دەڵێن: تۆ چۆن دەزانیت لە ئاسمان چی روویداوە؟ واتە: هێشتا سوورەتی (البقرة) دانەبەزیوە تا پێغەمبەر بزانێت خوای گەورە چۆن لەگەڵ فریشتەکان

وتوویژی کرد که دەیەوێت جێنشین لەسەر زەوی دروست بکات، بەڵام بە پێغەمبەر دەفەرموێت: لە ئایندەدا وردەکاریی ئەو ڕووداوەت بۆ دەنێرمە خوارەوە لە سوورەتی (البقرة)و دوای کۆچ، هەروەها لە ئایندەدا پرسیاریشت لێدەکەن لەو بارەوە، تۆ لە ئێستاوە ـ پێشئەوەی چیرۆکەکە بە وردەکارییەکەیەوە دابەزێت و پێشئەوەی بێباوەڕانیش پرسیارەکە بکەن ـ پێیان بڵێ: ئەوە هەواڵێکی گرنگ و گەورەیە، کە ئێوە نایزانن، بەڵام منیش نایزانم تا خوا بۆم نەنێرێتە خوارەوە:

﴿ قُلْ هُوَ نَبَؤٌا۟ عَظِيمٌ ﴿٦٧﴾ أَنتُمْ عَنْهُ مُعْرِضُونَ ﴿٦٨﴾ مَا كَانَ لِىَ مِنْ عِلْمٍۭ بِٱلْمَلَإِ ٱلْأَعْلَىٰٓ إِذْ يَخْتَصِمُونَ ﴿٦٩﴾ إِن يُوحَىٰٓ إِلَىَّ إِلَّآ أَنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٧٠﴾ إِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّى خَٰلِقٌۢ بَشَرًا مِّن طِينٍ ﴿٧١﴾ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِى فَقَعُوا۟ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ﴿٧٢﴾ فَسَجَدَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ كُلُّهُمْ أَجْمَعُونَ ﴿٧٣﴾ ﴾ (ص: ٦٧ـــ ٧٣) واتە: ( پێیان بڵێ: ئەمە هەواڵ و دەنگوباسێکی زۆر گەورە و گرنگە، بەڵام ئێوە پشتی تێدەکەن و گوێی بۆ ناگرن. خۆ من (مەبەست پێغەمبەرە) هیچ ئاگاداری ئەوە نەبووم کە چی گوزەراوە لە شوێنە بڵندەکاندا کاتێك کە فریشتەکان کێشەیان هەبوو لە جێنشینیی ئادەمدا ((**هێشتا نازانرێت کێشەکە چی بووە، چونکە هێشتا سوورەتی بەقەرە دانەبەزیوە تا وردەکاریی بابەتی وتوویژی فریشتەکان بخاتەڕوو**)). وەحی و نیگام بۆ نایەت تەنها لەبەرئەوە نەبێت کە من بێدارکەرەوەیەکی ئاشکرام. کێشەی فریشتەکان کاتێك بوو کە پەروەردگارت پێیوتن: من دەمەوێت

بەشەرێك لە قوڕ دروست بكەم. جا كاتێك دروستمكرد و لەو گیان و ڕۆحەی كە من خاوەنی ئەوم، فووم پێداكرد و گیان و ژیانم پێبەخشی، ئێوەی فریشتە هەمووتان سووژدەی (ڕێزو تەقدیری بە فەرمانی من) بۆ بەرن. هەموو فریشتەكان فەرمانی خوایان بەجێهێنا و سووژدەیان برد).

لێرەدا باسی ئەوە ناكات كە خوا وتووێژی كردووە لەگەڵ فریشتەكاندا لە بارەی جێنشینێك و ئەوانیش وەڵامیان داوەتەوە، بەڵكو یەك ئامازەی بچووك بەو وتووێژە دەكات كە دەفەرموێت: ﴿ مَاكَانَ لِيَ مِنْ عِلْمٍ بِالْمَلَإِ الْأَعْلَىٰٓ إِذْ يَخْتَصِمُونَ ﴾.. دیقەت بدە چ سەرنجێكی سەرنجڕاكێشە ! !

**سێهەم**: كە لە چیرۆكی خەڵقی ئادەم ورد دەبینەوە، دەبینین دوو دیمەنە، دیمەنێكیان وتووێژی خوای گەورەیە لەگەڵ فریشتەكان، لە بارەی دروستكردنی جێنشینێك، كە ئەم دیمەنە لە سوورەتی بەقەرەدا، بە تەواوەتی باسكراوە و لە شەش سوورەتەكەی دیكەدا تەنها "دیمەنی فەرمانكردن بە فریشتەكان بە كڕنووشبردن بۆ ئادەم" گرنگیی پێدراوە. دووەمیشیان دیمەنی وتووێژ و قسەكانی ئیبلیسە، كە لە سوورەتی (البقرة) بە كورتی باسكراوە و لە شەش سوورەتەكەی دیكەی باسی چیرۆكەكەدا، درێژەی پێدراوە و تیشكی زیاتری خراوەتەسەر، بەتایبەتی لە بابەتی سەرپێچیكردنی ئیبلیس لە فەرمانی خوا و پاساوی لە ئاگر دروستبوونی ئەم و لە قوڕ دروستبوونی ئادەم و ڕق و كینەی

بەرانبەر بە نەوەکانی ئادەم و سوێندخواردنی، کە فریویان بدات و فێڵکردنی لە ئادەم... هەموویشی بۆ ئەوەی کە خوای گەورە لە ڕێی ئەم چیرۆکەوە هۆشیاریی بدات بە نەوەکانی ئادەم کە وریای فێڵەکانی شەیتان بن و فریوی مەخۆن، لەبەر ئەوەشە چوار جار لەو حەوت جارەدا بە وردیی باسیکردووە، بەڵام بە شێوازی جۆربەجۆر خستوویەتیە ڕوو، چ بە جەختکردنە سەر وتووێژەکە هەمووی، یان قۆناغێکی، یان دیمەنێکی، یان بە ئاشکراکردنی ڕێگایەك لە ڕێگاکانی کاری شەیتان بۆ فریودانی مرۆڤ.. کە ئەمانە هەمووی مەبەستی سەرەکیین لە هاتنەخوارەوەی سوورەتە مەککەییەکاندا بە گشتی و ئەم بەشەی چیرۆکەکەش لەگەڵ ئەو مەبەستەدا دەگونجێت... لەکاتێکدا سوورەتە مەدەنییەکان زیاتر بۆ دواندنی ئیمانداران و ڕێکخستنی کاروباری ژیانیانە و بە بیرخستنەوەی ئیبلیسی دوژمنی خوا، پێویستیی بەو وردەکارییەی سەردەمی مەککە نییە، لەبەرئەوە ئەم بەشەی چیرۆکەکە لە سوورەتی (البقرە) کە مەدەنییە، بە کورتی هاتووە.

ئیتر بەمجۆرە بۆمان دەردەکەوێت کە "دووبارەکردنەوە"ی چیرۆك لە قورئاندا، ئەرکێکی گرنگی هەیە و ڕێگای جۆربەجۆری بۆ گیراوەتە بەر، تا لەگەڵ مەبەستە سەرەکییەکانی قورئاندا بگونجێت و لەگەڵ ئامانجی ئەو سوورەتەشدا یەکانگیر بێت، کە چیرۆکەکەی تێدا

باسکراوه، کە ئەمە هەمووی بە پێوەری ورد داڕێژراوە لە ڕووی خستنەڕووی ماناکانی بە شێوازی هونەری ئاستبەرز... پاك و بێگەردیی بۆ خوا، خاوەن و دابەزێنەری ئەم قورئانە...

# بەشی چوارەم:
# باسکردنی وردەکاری، یان بە پوختی باسکردن

لەم بەشەدا لەوە دەدوێین کە هەندێکجار قورئانی پیرۆز هەندێك لە چیرۆکەکانی درێژە پێدەدات، لە هەندێك شوێنی دیکەشدا زۆر بە کورتی باسی دەکات، یاخود چیرۆکەکە بە کورت و پوختی لە سەرەتاوە باسدەکات و پاشان درێژەی پێدەدات، یان هەندێکجار ڕێڕەوی چیرۆکەکە بە کورتی باس دەکات و دواتر ڕووداوەکانی بە فراوانی و درێژیی، دواتر هەندێکی دیکەی کورت دەکاتەوە، یان بازی بەسەردا دەدات... هەموو ئەمانە بەپێی خزمەتکردنە بە مەبەستە سەرەکییەکەی چیرۆکەکە و پاشان خزمەتکردن بە مەبەستە سەرەکییەکانی هاتنەخوارەوەی قورئان بە گشتی.

جا با ئێستا، بە خاڵ هەندێك جۆر جیا بکەینەوە:

١ـ ئەگەر چیرۆکێك سەرەتا بە کورتی و کۆکراوەیی دەستپێبکات، ئەوا مەبەست لێی ناساندنی چیرۆکەکەیە لەو پێشەکییەدا، بۆ ئامادەکردنی دەروونی گوێگر بۆ خستنەڕووی تەواوی چیرۆکەکە بە دوایدا، هەروەها بۆ ناساندنی هۆکاری هێنانی ئەم چیرۆکە و باسکردنی

لەم شوێنەدا. هەندێکجار ئەو پێشەکییە کورتە لایەنێکی سەرسامکەری چیرۆکەکەی لەخۆگرتووە بۆ ڕاکێشانی سەرنجی گوێگر، وەك ئەوەی کە ریکلامێـك بێـت بـۆ سـەرجەمی چـیرۆکەکە، بـەوەی کـە دیمـەنێکی سەرنجڕاکێشی چیرۆکەکە لە سەرەتادا دەهێنێت، تا خەڵك کەمەندکێش بکات بـۆ بینـینی و خوێندنـەوەی، وەك لـە چـیرۆکی یوسـفدا (سـەلامی خوای لێبێت) ئەمە دەبینین، کە سەرەتا بـە خـەونێك دەستپێدەکات و پاشـان قسـەی لەسـەر دەکـات، دواتـر لـە سـەرەتاوە چـیرۆکەکە دەگێڕێتەوە... یاخود چیرۆکی مووسا کـە سـەرەتا لـە بیابانـدا شـەوی بەسـەردا هـاتووە و مەڕوماڵاتەکـەی پەرشـوبڵاوبوون و لـە دوورەوە تروسـکایی ئاگرێـك دەبینێـت، بـەڵام کـە دەچـێت، لـەوێ پـەروەردگار لەگەڵی دەدوێت و ئـیتر چـیرۆك دەستپێدەکات... وەك لـە سـوورەتی (النمل)دا هاتووە.

٢- زۆرینەی جار، لە پێشەکیی چیرۆکەکاندا ئاڕاستـەی قسـە ڕوو بـە سـەروەرمانە (درووود ی خـوای لێبێـت) وەك بەڵگـەی ئـەوەی کـە ئـەم چیرۆکە لەبەر خاتری ئەو باسدەکرێت، جا چ بـە ڕێگەیـەکی ڕاسـتەوخۆ ئەمـە وترابێـت، تـا دڵنیـا و ڕاگـیر بێـت لەسـەر بانگەوازەکـەی و سـارد نەبێتـەوە، یـاخود بـۆ پشـتگیریی بانگەوازەکـەی پەرچـوو (سەرئاسـا) "موعجیزە"یەکی لە چـیرۆکەکەدا هێنابێـت، یـان بـۆ بەرپەرچـدانەوەی نەیارانی و ترسـاندنیان بێـت.. بـەڵام لـە هـەموو ئـەم بارانـەدا، قسـەکە ئاڕاسـتەی پێغەمبـەر کـراوە (درووود ی خـوای لێبێـت) بـۆ باسـکردنی

هۆکاری هێنانی ئەم چیرۆکە لەم کاتەدا. بۆ نموونە: ﴿ نَتْلُواْ عَلَيْكَ مِن نَّبَإِ مُوسَىٰ وَفِرْعَوْنَ بِٱلْحَقِّ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٣﴾ ﴾ (القصص: ٣) واتە: (ئێمە هەندێك لە هەواڵ و بەسەرهاتی گرنگی ڕاست و نەگۆڕی مووسا و فیرعەون دەخوێنینەوە بە سەرتدا، بۆ ئەوەی سوود بگەیەنین بە گەلێك کە بڕوا دەهێنن). لێرەدا خوا ئاگاداری دەکاتەوە کە ئێستا چیرۆکی مووسا و فیرعەونی بۆ باسدەکات و ئاڕاستەی ئەوی دەکات، مەبەستیش لێی ڕووەو گەلی ئیماندارانی بکات کە لە پەندو ئامۆژگارییەکانی تێدەگەن.. لە سوورەتی (الكهف)یشدا پێشەکییەکە کەمێك درێژتر دەدوێت لە ناساندنی هاوڕێیانی ئەشکەوت، پاشان دەستدەکات بە گێڕانەوەی چیرۆکەکەیان بە ئاڕاستەکردنی قسە ڕووەو سەروەرمان، کە دەفەرموێت: ﴿ نَّحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ نَبَأَهُم بِٱلْحَقِّ ﴾ (الكهف: ١٣) واتە: (ئێمە هەواڵی ئەوانت بە ڕاستیی بۆ دەگێڕینەوە)، بەڵام پێشەکییەکە خۆی بە ئایەتێك دەستپێدەکات، کە کار لە بیر و هۆش دەکات و دەیوروژێنێت و سەرنج ڕادەکێشێت، کە دەفەرموێت: ﴿ أَمْ حَسِبْتَ أَنَّ أَصْحَٰبَ ٱلْكَهْفِ وَٱلرَّقِيمِ كَانُواْ مِنْ ءَايَٰتِنَا عَجَبًا ﴿٩﴾ ﴾ (الكهف: ٩) واتە: (ئایا تۆ پێتوایە کە ئەسحابی کەهف و ڕەقیم لە نێو موعجیزات و ئاکارانی سەرسوڕێنەر و سەرسامکەری ئێمە، سەیر و جێی واقوڕمانە؟).. ئەم ئایەتەش هەر ئاڕاستەی سەروەرمان کراوە، بەڵام بە شێوازی پرسیار، کە جیاوازترە لەو شێوازەی دیکەی پێشەکیی

چیرۆکەکان، کە زیاتر بە شێوەی: ﴿ نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ ﴾ (ئێمە بۆت دەگێڕینەوە)دێت.

٣ـ هەندێکجار لە پێشەکیی چیرۆکەکاندا جۆرێك لە "هێما" و ڕەمز دێت، تا ببێتە کلیل بۆ کردنەوەی چیرۆکەکە، کە سەرتاپای گرێی چیرۆکەکە لەسەر ئەو هێمایە دارێژراوە، کە ئەمەش لوتکەی هونەرە لە چیرۆکەکەدا.. نموونەی ئەمەش سوورەتی (یوسف)ە، کە سەرەتا بە هێمایەك دەستپێدەکات، کە خەونێکە یوسف تیایدا دەبینێت: ﴿ أَحَدَ عَشَرَ كَوْكَبًا وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ ﴾ واتە: (یازدە ئەستێرە و خۆر و مانگ کڕنووشی بۆ دەبەن)، ئیتر ئەم خەونە دەبێتە کلیلی چیرۆکەکە، بەوەی دەبێتە هۆی ئەو هەموو نارەحەتی و بەڵا و موسیبەتانەی کە بەسەری دێت، هەروەها بەڵگەی پێغەمبەرایەتییەکەیەتی، پاشان لە کۆتایی چیرۆکەکەیدا خەونەکە دێتەدی و بەمشێوەیە هێما و ڕەمزەکە لێکدەداتەوە کە: خۆر و مانگەکە دایك و باوکییەتی و یازدە ئەستێرەکەش براکانیەتی و لە کۆتایی چیرۆکەکەدا کڕنووشی بۆ دەبەن، نەك کڕنووشی پەرستش، بەڵکو کڕنووشی ڕێز و سڵاو..

٤ـ هەندێکجار، کورت و پوختکردنەوەی چیرۆکەکە لە کۆتاییەکەیدایە، ئەمەش بۆ ڕوونکردنەوەی هۆکار و حیکمەتی باسکردنی ئەم چیرۆکە، وەك لە سوورەتی (هود)دا، کە تیایدا چیرۆکی چەندین پێغەمبەر باسکراوە، پاشان لە کۆتاییدا دەفەرموێت: ﴿ وَكُلًّا

نَقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلرُّسُلِ مَا نُثَبِّتُ بِهِۦ فُؤَادَكَ ۚ وَجَآءَكَ فِى هَٰذِهِ ٱلْحَقُّ وَمَوْعِظَةٌ وَذِكْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٢٠﴾ ﴾ (هـود: ١٢٠) واتـه: (هـهمـوو ئـهوانـهشـت بـۆ دهگێڕینهوه له چیرۆك و ههواڵی پێغهمبهران، بۆ ئـهوهی كـه دڵـی تـۆی پیّ دابمهزرێنین و دڵنیات بكهین، دڵنیاش به، كه لهم ههواڵانهدا حـهق و ڕاسـتیت بـۆ هـات و بـۆت ڕوونكرایـهوه، هـهروهها ئامۆژگـاری و بیرخسـتهوهی باشـی تێدابوو بـۆ ئیمانـداران)، دیقـهت بفـهرموون: بـۆ ڕاگیركردن و چهسپاویی دڵی تۆ ئهی محهممهد..

٥ـ زۆرینـهی ئـهو چـیرۆكانهی قورئـانی پـیرۆز، كـه زۆر بابهتهكـهی وردكردووهتـهوه و بـه درێـژیی لێیـدوواوه، زیـاتر ئـهو چـیرۆكانهن كـه سهبارهت به بهنی ئیسرائیلن، بهتایبهتی ئـهو وتووێژانـهیان كـه لهگـهڵ پێغهمبهرهكانیانـدا كردوویانـه، ئهمـهش جێـی سهرسـامی نییـه، لهبهرئهوهی بهنی ئیسرائیل، خۆیـان هـهر بـهوه ناسـراون كـه بێگـوێیی پێغهمبـهرانیان كـردووه و ڕهق و تونـد و گێرهشـێوێنن، بـهوهش ململانێكانیان زیادبووه له چیرۆكهكاندا.. دوو نموونه لهمبارهیهوه بـاس دهكهین:

**نموونهی یهكهم:** چیرۆكی سهربڕینی مانگاكهی بهنی ئیسرائیل، كـه زۆر بـه درێـژیی باسـكراوه، ئهگـهر بـهراوردی بكـهین لهگـهڵ چـیرۆكی دیكهدا، كه لهوانهیه گرنگتر بێت لهم باسه، بهڵام بهو شێوه درێژییه ورد نهكراوهتـهوه، وهك ههنـدێك لـه ڕووداوهكـانی چـیرۆكی هـود و سـاڵح و (لوط) و داوود و سولهیمان (سهلامی خوایان لێبێت).

جا با کەمێك لەسەر ئەم چیرۆکە هەڵوێستە بکەین:

بەپێی سەرچاوەکان، پیاوێك لە بەنی ئیسرائیل دەکوژرێت، خزمێکی خۆی دەیکوژێت تا میراتییەکەی ببات، پاشان دەیانەوێت جگە لە میراتییەکەی، خوێنباییەکەیشی وەرگرن، ئەوەش بەوەی دەیانەوێت کوشتنەکەی بسەپێنن بەسەر کەسانێکی دیکەدا، هاتن بۆ لای مووسا (سەلامی خوای لێبێت) تا بکوژەکەیان بۆ بدۆزێتەوە و خوێنباییەکەیان بۆ لێبسەنێت ـ بە حسابی خۆیان ـ. بەڵام تووشی سەرسامی هاتن کە مووسا پێی فەرموون بچن مانگایەك سەرببڕن، ئەوانیش ترسان ئەم مەسەلەیە ببێتە هۆی ئاشکراکردنی کارەکەیان، لەبەرئەوە خاوە خاویان تێدا دەکرد. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦٓ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تَذْبَحُوا۟ بَقَرَةًۭ ۖ قَالُوٓا۟ أَتَتَّخِذُنَا هُزُوًۭا ۖ قَالَ أَعُوذُ بِٱللَّهِ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿٦٧﴾ قَالُوا۟ ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِىَ ۚ قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌۭ لَّا فَارِضٌۭ وَلَا بِكْرٌ عَوَانٌۢ بَيْنَ ذَٰلِكَ ۖ فَٱفْعَلُوا۟ مَا تُؤْمَرُونَ ﴿٦٨﴾ قَالُوا۟ ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا لَوْنُهَا ۚ قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌۭ صَفْرَآءُ فَاقِعٌۭ لَّوْنُهَا تَسُرُّ ٱلنَّٰظِرِينَ ﴿٦٩﴾ قَالُوا۟ ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِىَ إِنَّ ٱلْبَقَرَ تَشَٰبَهَ عَلَيْنَا وَإِنَّآ إِن شَآءَ ٱللَّهُ لَمُهْتَدُونَ ﴿٧٠﴾ قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌۭ لَّا ذَلُولٌۭ تُثِيرُ ٱلْأَرْضَ وَلَا تَسْقِى ٱلْحَرْثَ مُسَلَّمَةٌۭ لَّا شِيَةَ فِيهَا ۚ قَالُوا۟ ٱلْـَٰٔنَ جِئْتَ بِٱلْحَقِّ ۚ فَذَبَحُوهَا وَمَا كَادُوا۟ يَفْعَلُونَ ﴿٧١﴾ ﴾ (البقـرة: ٦٧ــ ٧١)، واتـە: (یادی ئەو نیعمەتە بکەنەوە کاتێك مووسا بە قەومەکەی وت: بێگومان خوا فەرمانتان پێدەدات کە مانگایەك سەرببڕن، وتیان: ئایا دەمانکەیتە

گاڵتەجاڕی خۆت؟ مووسا وتی: پەنا دەگرم بە خوا بچمە ڕیزی نەفامانەوە. پاشان وتیان: لە پەروەردگارت داوا بکە بۆمان ڕوونبکاتەوە ئەو مانگایە کامەیە؟ مووسا وتی: بەڕاستی خوا دەفەرموێت: ئەو مانگایە نە پیرە و نە پارێنە، بەڵکو میانە ساڵە. چ فەرمانێکتان پێدراوە جێبەجێی بکەن. کەچی وتیان: لە پەروەردگارت داوا بکە بزانین ڕەنگی چۆنە؟ مووسا وتی: بێگومان خوا دەفەرموێت: ئەو مانگایە مانگایەکی ڕەنگ زەردی تۆخە، تەماشاکارانی دڵخۆش دەکات. کەچی هەر وتیان: لە پەروەردگارت داوا بکە تا بە تەواویی بۆمان ڕوونبکاتەوە بزانین کامەیە؟! چونکە بە ڕاستی ئەم گاگەلە سەری لێتێکداوین و ڕەنگی زۆربەیان لەیەك دەچێت، ئەو مانگایەمان بۆ نادۆزرێتەوە، بە ڕاستی ئێمە ـ ئەگەر خوا ویستی لەسەر بێت ـ ڕێنموویی وەردەگرین. مووسا وتی: بە ڕاستی خوا دەفەرموێت: ئەوە مانگایەکە هێشتا ڕانەهێنراوە زەوی بکێڵێت و جووت بکات، ئاودێری کشتوکاڵیش ناکات، بێ عەیبە و یەك ڕەنگە و هیچ پەڵەیەکی تێدا نییە، ئەوسا وتیان: ئا ئێستە ئیتر هەواڵی ڕاستەقینەت پێدراین (ئیتر دوای هەوڵ و کۆششێکی زۆر بەدەستیانهێنا) و سەریان بڕی، هەرچەندە خەریك بوو ئەو کارەش نەکەن)....

## با بێین چیرۆکەکە شی بکەینەوە:

ململانێیە لە نێوان مووسا و بەنی ئیسرائیل، کە بەردەوام ڕێگر و ئاستەنگ دادەنێن لەبەردەم جێبەجێکردنی کارەکەدا، هێزی حەق و ڕاستی، لە بەرانبەریدا هێزی نکوڵیکردن و سەرکێشی و بێفەرمانی، بەمجۆرە وتووێژەکە درێژەی پێدەدرێت، بەڵام ئەوان هەر ئاستەنگ دادەنێن و خۆیان بێئاگا دەکەن تا کارەکە نەکەن، بەمجۆرە درێژە دەکێشێت، بەڵام فەرمانی خوا هەردەبێت جێبەجێ بکرێت، تا لە کۆتاییدا هەرچەندە ملەجەڕە دەکەن، ناچار ملدەدەن بە جێبەجێکردنی و مانگاکە ـ کە بە تایبەتمەندییەکی ورد و پارەیەکی زۆر کڕیویانە ـ سەردەبڕن، کە ئەگەر لە سەرەتاوە فەرمانەکەیان جێبەجێ بکردایە ئەو هەموو ناڕەحەتییەیان نەدەهاتە ڕێ. خوای گەورە ئەو وتووێژانەی نێوانیان کە بەرانبەر بە مووسا کردوویانە، سەرەڕای درێژییان، هەمووی باسدەکات و دەیگێڕێتەوە، لەگەڵ لابردنی ئەو ماوەیەی کە هەر فەرمانێك و وەڵامە نالۆژیکییەکەی ئەوان خایاندوویەتی، تا وێنەیەکی تەواو و دەگمەنی شێوازەکانی ملەجەڕە و ملبادانی بەنی ئیسرائیل پێشکەش بکات.. پاشان پێشکەشکردنی چیرۆکەکە لە کۆتاییدا دێتەوە سەر شێوازی کورت و پوختی، پاشئەوەی کە بە درێژیی باسی وتووێژەکەی کرد و مەبەستەکانی هێنایەدی، لە کۆتاییشدا زۆر بە کورتی ئەو هۆکارە باس دەکات کە لە پێناویدا خوای گەورە فەرمانی بەسەر پێغەمبەرەکەیدا داوە کە مانگاکە سەرببڕن، بە جۆرێك کورت و پوختە، کە زۆر "حەزف" و "هەڵبژاردنی تایبەت"ی تێدایە، ئەوەتا لە

کۆتاییـدا خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ وَإِذْ قَتَلْتُمْ نَفْسًا فَادَّارَءْتُمْ فِيهَا وَاللَّهُ مُخْرِجٌ مَا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ ﴿٧٢﴾ فَقُلْنَا اضْرِبُوهُ بِبَعْضِهَا كَذَٰلِكَ يُحْيِي اللَّهُ الْمَوْتَىٰ وَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٧٣﴾ ﴾ (البقرة: ٧٢ـ ٧٣)، واتە: (کاتێك کەسێکتان کوشـت و یەکسـەر ئـاژاوە لـە نێوانتانـدا بـەرپابوو، خـوای گـەورەش ئـەوەی دەتانشـاردەوە دەریخسـت و ئاشـکرای کـرد. پاشان وتمان: بە پارچەیەك لەو مانگایە، بدەن بە لاشەی کوژراوەکەدا، ئا بەو شێوەیە خـوا مـردووان زینـدوو دەکاتـەوە و دەسـەڵاتی خۆیتـان نیشان دەدات بۆ ئەوەی تێبگەن و ژیر بن)... پاشان دیقەتی ئەم خاڵانە بدەن:

١ــ ئایەتــەکان پێشخســتن و دواخســتنێکی بەمەبەســتی تێدایــە، لەبەرئەوەی زنجیرەی باسەکە بەپێی ڕووداوەکانی بە هەواڵی کوشتنەکە دەستپێدەکات، کە ئەم ئایەتی (٧٢)یە، پاشان بە دوایدا فەرمانکردن بە سەربڕینی مانگاکە و ملەجەڕێیان کە لە ئایەتەکانی (٦٧ـ٧١) باسکراوە، واتە پێش ئایەتی هەواڵی کوشتنەکە باسی کـراوە. پاشـان لـە کۆتاییـدا فەرمانی ئـەوەی بـە پارچـەیەك لـە گۆشـتی مانگاکـە بـدەن لـە لاشـەی کوژراوەکە تا زیندوو ببێتەوە، بەڵام لـە ڕیزبەنـدیی ئایەتەکانـدا ئایـەتی هەواڵی کوشتنەکە لە کۆتاییدا هاتووە.

هۆکـاری ئـەم پێشخسـتنی فـەرمانی سـەربڕینی مانگـا و دواخسـتنی هەواڵی کوشتنەکە، دوو شتە:

یەکەم: ئاشکراکردن و ڕوونکردنەوەی ملەجەڕێ و بێفەرمانیی بەنی ئیسرائیل، بەو شێوەیەی کە ڕوونکرایەوە.

دووەم: دواخستنی ڕەگەزی "کتوپڕی" و "موفاجەئە"، کە هاوتەریب بە پەند و وانەکانی چیرۆکەکە هاتووە، کە ئەویش بریتییە لە:

﴿كَذَٰلِكَ يُحْيِ ٱللَّهُ ٱلْمَوْتَىٰ وَيُرِيكُمْ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٧٣﴾﴾

(البقرة: ٧٣)، واتە: (بەو شێوەیە خوا مردووان زیندوو دەکاتەوە و دەسەڵاتی خۆیتان نیشان دەدات بۆ ئەوەی تێبگەن و ژیر بن)، واتە ئەرکی سەرەکیی چیرۆکەکە ئەمەیە: **زیندووکردنەوەی مردووان و نیشاندانی دەسەڵاتی خوا..**

٢- سەرەڕای ئەوەی ڕووکاری ئاشکرای چیرۆکەکە ئەوەیە، بکوژەکە بدۆزرێتەوە، بەڵام ئەم بەشە بچووکە لە چیرۆکەکەدا لابراوە و کۆتایی چیرۆکەکە بەرەو مەبەستێکی دیکە براوە، کە لەوە گرنگترە ئەویش باسکردن و ڕوونکردنەوەی توانا و قودرەتی خوایە لە زیندووکردنەوەی مردوودا، بەڵام ناسینی کەسی بکوژ، ئەوە کارێکی لاوەکی و ناسەرەکییە، بە بەراورد بە توانای خوا لە زیندووکردنەوەی مردوودا، ئەوە ناسینەوەی بکوژ هەر زۆر ئاسانە، لەبەرئەوە لە کۆتاییدا دەفەرموێت: ﴿كَذَٰلِكَ يُحْيِ ٱللَّهُ ٱلْمَوْتَىٰ﴾ (ئا بەم شێوەیە خوا مردوو زیندوو دەکاتەوە)، بەڵام نافەرموێت: (كذلك نكشف سر القاتل) (ئا بەم شێوەیە نهێنی کابرای بکوژتان بۆ ئاشکرا دەکەین).

بــەمجۆرە دەبیــنین ئــەرکی حــەزف و پێشخســتن و دواخســتن و درێژکردنــەوەی بابەتەکــە و کــورت و پوختکردنــەوەی لــە کۆتاییــدا، بــۆ بەدیهێنانی ئامانجێکە کە ئــەوان لێــی بێئاگــابوون، کــە پێیــانوابوو خــوا ناتوانێت بکوژەکەیان بۆ بناسێتەوە، بەڵام کە سەیریان کرد، نەك کەسە بکوژەکەی بۆ دۆزینەوە، بەڵکو زیاتر لــەوە، کەســە کوژراوەکەیشــی بــۆ زیندووکردنەوە ! !. لەمەوە دەرکەوت هەریەکە لەو هونەرانــە، ئامــانجی خۆیان لە چیرۆکەکەدا پێکاوە...

**نموونەی دووەم:** گۆچانەکەی مووسا (سەلامی خوای لێبێت):

چیرۆکی ئەم گۆچــانە بــەو شــێوەیەیە، کــە کاتێــك مووســا (ســەلامی خوای لێبێت) لەگەڵ ماڵ و منداڵیدا لە مەدیەنەوە گەڕایەوە بۆ میسر، لە ڕێگادا کە شەوی بەسەردا هات و ڕێی لێتێکچــوو، لــە دوورەوە ئــاگرێکی بەدی کرد، بە ماڵ و منداڵەکەی وت: ئێوە دانیشن با من بچــم بــزانم لای ئەو ئاگرەوە ڕێنیشاندەرێك نابینمەوە، کاتێك کە گەیشتە لای ئاگرەکــە پەروەردگاری باڵا بانگی کرد و قسەی لەگەڵدا کرد و کردی بە پێغەمبەر و ڕەوانەکراوی خۆی بۆ لای فیرعەون، لەوێ لــە چوارچــێوەی وتووێــژی نێوانیاندا خوای گەورە پرسیاری لــە مووســا کــرد، کــە ئــەوە چــییە بــە دەستەوە ئەی مووسا؟ کە مەبەست لێی ئەو گۆچانە بوو کە مووسا بــە دەســتییەوە بــوو، ئــیتر لێــرەوە پرســیار و وەڵامێکــی ســەرنجڕاکێش دەستپێدەکات.

با سەرەتا ئایەتەکان بخوێنینەوە: ﴿ وَمَا تِلْكَ بِيَمِينِكَ يَٰمُوسَىٰ ﴿١٧﴾ قَالَ هِيَ عَصَايَ أَتَوَكَّؤُاْ عَلَيْهَا وَأَهُشُّ بِهَا عَلَىٰ غَنَمِي وَلِيَ فِيهَا مَـَٔارِبُ أُخْرَىٰ ﴿١٨﴾ ﴾ (سوورەتی تەها: ١٧ ـ ١٨)، واتە: (ئەوە چییە بە دەستی ڕاستەوە ئەی مووسا؟! وتی: ئەوە گۆچانەکەمە، لە کاتی ڕۆیشتندا دەیگرم بە دەستەوە، هەروەها گەڵای دارانی پێئەوەرێنم بۆ پەز و مەڕەکانم، هەروەها چەند کاری دیکەیشی پێ ئەنجام دەدەم). دەبینین خوای گەورە یەك پرسیار لە مووسا دەکات (ئەوە چییە بە دەستی ڕاستتەوە)، ئەویش دەتوانێت بە دوو وشە وەڵامبداتەوە و بفەرموێت (هِيَ عَصَايَ ) (ئەوە گۆچانەکەمە).. بەڵام مووسا درێژە بە وەڵامەکەی دەدات و ئەو ئەرکانەی دیکەی کە بە گۆچانەکەی ئەنجامی دەدات، هەمووی باس دەکات. جا لێکدەرەوانی قورئان لەم بابەتەدا ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە مووسا کاتێك زانیویەتی ئەمە مەقامی قسەکردنە لەگەڵ پەروەردگاردا، دەیەوێت ماوەی وتووێژەکە درێژە پێبدات تا تام و چێژ لەو دیدارە ببینێت، لەبەرئەوە درێژە بە وەڵامەکەی دەدات.. تەنانەت لەبەرئەوە لە کۆتاییشدا دەڵێت "کاری دیکەیشی پێ ئەنجام دەدەم" بەو ئومێدەی خوای گەورە لێی بپرسێت ئەو کارانەی دیکە چین، تا ئەویش وەڵامبداتەوە و بەوەش درێژە بە حیوارەکە بدات.. بەڵام ئایا هەر ئەوەندەیە؟... بێگومان نا...

مووسا (سەلامی خوای لێبێت) کە دەچێت بۆ چیاکە بۆ لای ئاگرەکە، تاکو خۆی گەرمبکاتەوە و گەرمیی بهێنێتەوە بۆ ماڵ و

منداڵەکەشــی کــە لــەو شــەوە تاریکــەدا بارودۆخیــان لێتێکچــوو بــوو، هەروەها بۆ ڕێنیشاندان و لەوانەیە بۆ ئاو و خۆراکیش بوویێ، ئەگەرچی باسی نەکراوە، بەڵام لەوێ کتوپڕ نیگایەکی غەیبی بۆ دێت کە قسـە و گفتوگــۆی لەگەڵــدا دەکــات و خــۆی پێدەناســێنێت و داوای لێــدەکات بیپەرستێت، ئەمە هەمووی وتووێژ و حیوارێك بووە کە کورت نـەبووە و کەمی نەخایاندووە. کۆتایی وتووێژەکەیش بە پرسـیارێکی پـەروەردگار دێت کە بە مووسا دەفەرموێت: ﴿ وَمَا تِلْكَ بِيَمِينِكَ يَٰمُوسَىٰ ﴿١٧﴾ ﴾، ئەوە چییە بـە دەسـتی ڕاسـتتەوە ئـەی مووسـا؟! مووسـاش کـە ئـەو وەڵامانــە دەداتــەوە و لێکــدەرەوانی قورئــانیش کــە دەڵــێن بــۆ زیــاتر درێژەدانە بە حیوارەکە، ئێمەش دەتوانین بڵێین ئـەی باشـتر نـەبوو بـۆ مووسا واز لەو وەڵامە درێژە بهێنێـت تـا تـام و چـێژ لـە گـەورەیی ئـەو هەڵوێستە و ئەو وتانەی پەروەردگار ببینێـت لـە جیـاتی ئـەوەی خـۆی قســە بکــات؟ ئەمــە ئەگــەر بــاوەڕ بــەوە بکــەین کــە مووســا لەبــەر درێژکردنەوەی دیدارەکە ئـەو وەڵامـەی دابێتـەوە... بـەڵام کـە دیقـەت دەدەین خوای گەورە بەو پرسیارە مەبەستی ئەوە نـەبووە کۆتـایی بـە دیدار و وتووێژەکە بهێنێت تا مووسا وابزانێت ئیتر کاتەکە تەواو بـووە، یان خەریکە تەواو دەبێت، بەڵام با ئەم درێژی بکاتەوە. بەڵگـەش، ئـەو پرسیارە خۆیەتی کە ئاماژەیەکە بۆ بەردەوامبوونی وتووێژەکە، ئەگەرنا خوای گەورە دوورە لەوەی بە شتی بێبەها بیەوێت کاتەکە درێژبکاتەوە و هەروەها پێغەمبەرەکەیشی لەوە بەدوورە.

کەواتە پێویستە بە دوای هۆکارێکی دیکەدا بگەڕێین بۆ ئەو وەڵامە دوور و درێژەی مووسا (سەلامی خوای لێبێت)، کە خوای گەورەش بەهەمانشێوە لە قورئانەکەیدا کە دایناوە ببێت بە بەرنامە و دەستووری ژیان، بەجێینەهێشتووە و بۆی گێڕاوینەتەوە.

جا بۆ ئەوەی بگەینە ئەو مەبەستەی بەکارهێنانی ئەو وەڵامە درێژەی مووسا (سەلامی خوای لێبێت)، دەبێت چەند خاڵێك هەیە ڕوونی بکەینەوە، کە هاوپەیوەندە بە سیاقی چیرۆکەکەوە:

١ـ یەکەم خاڵ کە بیرمانی بۆ دەچێت، پێکهاتە و سروشتی ئەو گۆچانەیە، ئایا گۆچانەکە لە "دار" دروستنەکراوە؟ داریش سوتەمەنییە و قابیلی ئەوەیە گڕ بگرێت.

٢ـ مووسا بەرەو ئاگرەکە چووە بە نیازی ئەوەی لەو ئاگرە ببات بۆ خانەوادەکەی کە بەجێیهێشتوون. ئاگریش لە دارەوە دروست دەبێت..

٣ـ مووسا کە بەرەو ئاگرەکە چووە، پێشبینی ئەوەی کردووە کە مرۆڤێك لەوێ ببینێت تا داوای لێبکات بەشێك لە پشکۆی ئاگرەکە، یان دارێك لەو ئاگرەوە ببات بۆ خانەوادەکەی، بەڵام کەسی نەبینی، بەڵکو پەروەردگاری بەرز و بڵند لەوێ قسەی لەگەڵدا کرد، بەڵام خوای نەبینی، هەروەها لای ئاگرەکەش کەسی نەبینی. ئەی باشە مووسا چی دەکرد ئەگەر خوای تەعالا قسەی لەگەڵدا نەکردایە لەوێدا؟ ئایا بەشی پێویستی خۆی لە ئاگرەکە دەبرد بەبێ ئەوەی چاوەڕێ بکات مۆڵەت لە یەکێك بخوازێت؟ یاخود دەگەڕایەوە و هیچی لە ئاگرەکە نەدەبرد مادەم

کەسی لێنەبووە و خاوەنی ئاگرەکەی نەبینیوە؟... نازانین.... بەڵام مووسا کەوتە ئەو هەڵوێستەوە لەبەرئەوە وەڵامەکەیشی خۆبەخۆ بەو شێوەیە هات! با نموونەیەك لەم بارەیەوە ڕوون بکەینەوە:

پیاوێك دەچێت بۆ ماڵی برادەرێکی، چەپکێك گوڵی ڕازاوە و جوانی بە دەستەوەیە، کاتێك نزیك دەبێتەوە لە باخچەی ماڵەکە لە دەرگا دەدات و چاوەڕێ دەکات برادەرەکەی بێتە دەرەوە و پێشوازی لێبکات.. کتوپڕ کابرایەك کە ئەم نایناسێت لەولاوە ئاماژەی بۆ دەکات و دەڵێت: بەڕێز! من خاوەنی ئەو ماڵەم و من لە خاوەنەکەیم کڕیوە و ئەو باخچەیەم لێدروستکرد و پڕمکردووە لە گوڵ و گوڵزاری جوان، ئەی تۆ ئەوە چییە بە دەستەوە؟.. ئا لەو کاتەدا پیاوەکە تەنها یەك شت بە بیریدا دێت: ئەویش ئەوەیە ئەم خاوەن ماڵە وادەزانێت ئەو چەپکە گوڵەی کە ئەم خۆی هێناویەتی، وادەزانێت لە باخچەکەی ئەو کردوویەتییەوە و هێناویەتی، یان خۆی هێناویەتی، بەڵام دەیەوێت لەم باخچەیەش گوڵی دیکەی بخاتە سەر، لەبەرئەوە لەو کاتەدا لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا دەڵێت: ئەمە گوڵە و خۆم لە گوڵفرۆشێك لە فڵان شوێن کڕیومە و جۆرەکانی ئەوە و ئەوەیە و هێناومە بۆ فڵان کەسی هاوڕێم، کە لەم خانووەدا دەژیا... بۆچی ئەو پیاوە وەڵامەکەی وا درێژ دەکاتەوە، لەکاتێکدا دەتوانێت لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا تەنها بڵێت: ئەمە چەپکە گوڵە..و تەواو؟.. لەبەرئەوەی مەبەست لە پرسیاری کابرا لایەنی دەرەکیی نییە، بەڵکو شتێکی دیکەیە، ئەگەرنا کابرای

پرسیارکەر دەبینێت ئەوە گوڵە بە دەستییەوە، بەڵام لەبەر شتێکی دیکە ئەو پرسیارە دەکات، پیاوەکەش لە مەبەستی کابرای پرسیارکەر تێدەگات، لەبەرئەوە ناڵێت ئەوە چەپکە گوڵە و بیبڕێتەوە، بەڵکو درێژە بە قسەکانی دەدات..

کەواتە، بە بەراورد بەم نموونەیە، دەتوانین بڵێین مووسا کاتێك هات بۆ لای ئاگرەکە، خۆیشی دارێکی بە دەستەوەیە "گۆچانەکەی"، لای ئاگرەکەش بێگومان دار هەیە کە بۆ سووتاندن بەکاربێت، جا کاتێك پرسیارەکەی پەروەردگار لەوکاتەدا بەو شێوەیەیە: ئەوە چییە بە دەستەوە مووسا؟ وەڵامەکە پڕ بە پێستەکەش ئەوەیە کە هۆکاری بوونی گۆچانەکە ڕوونبکاتەوە و هەر شتێکی دیکەش ڕوونبکاتەوە کە پرسیاربێت لە بارەی هۆکاری هاتنی بۆ لای ئاگرەکە، تا گومانی ئەوە دوور بخاتەوە کە مووسا بۆ ئەوە هاتبێت بەشێك لەو ئاگرە ببات بۆ خۆی، ئەگەرچی خاوەنەکەشی لێ نییە.. ئەگەرنا باسکردن لە سوودەکانی گۆچانێك، چ پێویست دەکات مووسا خۆی پێوە سەرقاڵ بکات و واز لە بیستنی وتەی پەروەردگار بهێنێت بۆ باسکردن لە گۆچانەکەی خۆی!!

پرسیارەکە لە میانەی هۆشیاریدانی پەروەردگاردا هاتووە، کە بە مووسا دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلسَّاعَةَ ءَاتِيَةٌ أَكَادُ أُخْفِيهَا لِتُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍۭ بِمَا تَسْعَىٰ ﴿١٥﴾ فَلَا يَصُدَّنَّكَ عَنْهَا مَن لَّا يُؤْمِنُ بِهَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ فَتَرْدَىٰ ﴾ (طه: ١٥-١٦)، واتە: ئەی مووسا (ڕۆژی دوایی بەڕێوەیە و دێت، خەریکە

کاتەکەی بشارمەوە تا هەموو کەس بەرانبەر بە هەوڵی خۆی پاداشت وەربگرێت، جا ئەی مووسا وریابە ئەو کەسەی بڕوای بە هاتنی قیامەت نییە و شوێن هەوا و ئارەزووی خۆی کەوتووە. وریا بە ڕێگریت لێنەکات لە بڕواپێبوونی، ئەوکات تیا بچیت)..

جا هێنانی پرسیارەکە یەکسەر بە دوای ئەم هۆشیاریدانەدا، زیاتر ئاماژە دەبەخشێت بەوەی کە پەیوەندییەك لە نێوان ئەو پرسیارە و ئەو نەهییەدا هەیە کە لە ئایەتەکەدا ئاماژەی پێدەکات، کە شوێن هەوا و ئارەزووکەوتنە.. مووسا وا گومانی بردووە کە ئەم پرسیارە ماناکەی ئەوەیە ئەو، واتە مووسا، گومانلێکراوە بەوەی هاتووە لەو ئاگرەی کە خاوەنەکەی لێ نییە، شتێك ببات کە هی خۆی نییە، یان لە دارەکەی، یان وەك بڵێی خۆراکێك پێداویستییەك ببات، لە ناویاندا ئەو گۆچانەی کە بە دەستییەوەیەتی لەو کاتەدا **لەوانەیە لەوێ هەڵیگرتبێت**... لەبەرئەوە وەڵامەکەیشی لەو کاتەدا وەڵامێکی تەواو لۆژیکییە و یەکانگیرە لەگەڵ ئەوەی کە لە دەروونی مووسادا هەیە بە تەواویی.. دیقەت بدەن مووسا دەڵێت:

ئەوە گۆچانەکەمە: واتە خۆم خاوەنیم و لە هیچ شوێنێك نەمبردووە.

لە کاتی ڕۆیشتندا خۆمی دەدەم بە سەردا و خۆمی پێ ڕاگیر دەکەم: واتە ئەوە دارێکی سادە و هاکەزایی نییە تا بتوانم دەستبەرداری ببم، یان گرێی پێوەبنێم تا بەوە کاروباری خۆگەرمکردنەوەی پێ ڕێکبخەم.

هـەروەها گـەڵای دارانـی پێـدەوەرێنم بـۆ پـەز و مـەڕەکانم: وەك جەختکردنەوە لەسەر ئەوەی کە ئەو خاوەنی ئەو گۆچانەیە و لە کـاتی کارکردندا سوودی لێوەردەگرێت.

هەروەها چەند کاری دیکەیشی پیٚ ئەنجام دەدەم: واتـە ئەگـەر ئـەو بەڵگانەی کە باسمکردووە بەس نییە، ئەوا چـەند کـاری دیکەیشـی پـیٚ ئەنجام دەدەم کە سوودم پێدەگەیەنن..

ئا بەم شێوەیە مووسا هەموو ئەو گومانانەی ڕەواندەوە کە پێیوابوو بە هۆی هاتنی بۆ لای ئاگرەکە، بۆی دروستببێت: گومانی بردن (ئەگـەر دروسـتبێت بڵـێین: دزیکـردن)، گومـانی ئـەوەی چـاوی بڕیبێتـە شـتی کەسێك...

ئەمە سەبارەت بە کەسی پرسیارلێکراو کە مووسایە (سەلامی خـوای لێبێت).. سەبارەت بە کەسی پرسیارکەر، ئـەوا هۆکـارێکی دیکـە هەیـە لـەم پرسـیارەی کـە لـەبارەی گۆچـانەکەوە دەکرێـت، ئـەو هۆکـارەش پەیوەندیی بە مەبەستی هێنانی ئـەم دەسـتەواژەوە هەیـە لـە قورئـانی پیرۆزدا لەلایـەك و لەلایـەکی دیکـەوە پەیوەندیشـی بـە پرسـیارکەرەوە هەیە، کە خوای گەورەیە.

لێرەدا دەبینین خوای گەورە لە دواییدا ئەم گۆچانە دەکاتە بەڵگـە و پەرچوو "موعجیزە"یەك بـۆ مووسـا، کـە بـە هۆیـەوە فیرعـەون زەلیـل

دەکـات و بــە ســەریدا زاڵ دەبێـت، هــەروەها گۆچـانەکە لـە هــەموو قۆناغەکانی دواتری چیرۆکەکەدا ڕۆڵ دەبینێت: لەو کاتەدا کە گۆچانەکە فڕێدەدات لای ئاگرەکە، پاشان کاتێك فیرعەون بانگ دەکات بۆ لای خوا لـە کۆشـکدا، پاشـتر کـە لەگـەڵ جادووبازەکانـدا بەرانبـەر و ڕووبـەڕوو دەبنــەوە، دواتـر کاتێـك لــە دەریاکـە پەڕینــەوە و خـۆی و گەلەکـەی ڕزگاریان بوو، گۆچانەکەی کێشـا بـە دەریاکـەدا، لـەو کاتەشـدا کـە بـە گۆچانەکە لە بەردەکەی دا و بوو بە دوازدە کانی. جا ئەم گۆچانە نـەك هەر بۆ ئێمـەی خوێنـەر، بـەڵکو بـۆ مووسـاش (سـەلامی خـوای لێبێـت) هەڵگری هەموو ڕەگەزەکانی چیرۆك بوو، هەر لە: تەشویق و ورووژاندن و ململانێ و گرێ، تا دەگاتە ئەنجام و چارەسەر.

خوای گەورە ئەم پرسیارەی لە مووسا کرد، تا هەرچییەك مووسا بە خەیاڵیـدا بێـت لـەبارەی گۆچـانەکەیەوە بیڵێـت، تایبـەت بـە سـوود و ئەرکەکانی، پاشان کتوپڕ بە شێوەیەکی موفاجیئ، ئـەوەی بـە خـەیاڵی مووسادا نەهات و هەرگیز بیری بۆی نەدەچوو، بە گۆچـانەکەی بیکـات، خوا پێی فەرموو و نیشانی دا، کە بوونیەتی بە مار، لەبەرئەوە پێویست بوو مووسا بەو وردەکارییەوە هەموو ئەو شتانە لەبارەی گۆچانەکەیەوە بڵێت.. جا ئەم حیوارە بچووکە لەبارەی گۆچانەکەوە هەر لە سـەرەتای چیرۆکەکەدا هـاتووە تـا ببێتـە پێشـەکییەك بـۆ ناسـاندنی گۆچـانەکە و

ئاماژەدان بەوەی گوێگر و خوێنەر جەخت بکەنە سەر ئەم گۆچانە، لەبەرئەوەی لە داهاتوودا ئەو گۆچانە دەبێتە هەڵسوڕێنەری چیرۆکەکە و لە چەندین شوێنی دیکەدا دێتەوە بەر باس.. ئیتر بەمشێوەیە هەموو پێشەکییەکی چیرۆکە قورئانییەکان ئەو ئەرکەیان هەیە.

بەمجۆرە بۆمان دەردەکەوێت، کە بە وردیی باسکردن، یان بە کورتی براندنەوەی باسێك لە چیرۆکە قورئانییەکاندا، مەبەستی وردی لە پشتەوەیە کە پەیوەندی بە بنیاتی چیرۆکەکەوە هەیە.

# بەشی یەکەم:
# جوڵە و بزاوتی رووداوەکان لە"حیوار"و "گێڕانەوەدا"

بە شێوەیەکی گشتی، رووداو لە چیرۆکە هونەرییەکاندا بە دوو شێوە دەجوڵێنرێت: رێگای یەکەم: رێگای "گێڕانەوە"، کە بریتییە لە باسکردنی ڕووداو و کەس و هەست و سۆز و هەڵچوون و شوێن و کات و هەرچی پەیوەندیدار بێت بە چیرۆکەکەوە، واتە لە رێگەی باسکردنەوە.

رێگای دووەم، ڕێگای "حیوار و وتووێژە"، کە تیایدا کاراکتەرەکانی چیرۆکەکە دەدوێن.

پێوەری کوالیتی باشی چیرۆك لە هەردوو شێوازەکەشدا بریتییە لە دوو شت:

یەکەم: توانای جوڵاندنی ڕووداوەکان و وروژاندنیان لە قۆناغە جۆربەجۆرەکانی چیرۆکەکەدا.

دووەم: ڕوونکردنەوەی ماناکان لە چیرۆکەکەدا بە وردیی بەبێ کەموکوڕی و بەبێ درێژدادڕیی.

ئەوەیشی کە زۆر گرنگە لە چیرۆکدا بە گشتی، کاریگەریی ئەو دوو شێوازەی چیرۆکە لەسەر "گرێ" و "ڕووداو" لە چیرۆکەکەدا.

**ئەنجا با بێین بۆ چیرۆکە قورئانییەکان:**

لـه چـیرۆکه قورئانییەکانـدا ململانـێ و بـەرگریی لـه وتووێژەکانـدا دەبینین، که ئەو بەرگری و ململانێیه له نێوان کاراکتەرە قسەکەرەکانی ناو وتووێژەکاندا روودەدات و پاڵ به رووداوەکانەوە دەنێت بۆ گەیشتنه ترۆپك.. بەمەش کاراکتـەرەکان دەبنـه دوو بـەرە، بەرەیـەکی بـەهێز و بەرەیەکی بێهێز و بێتوانا، که بـەوەش رووداو دروسـت دەبێـت و پـەرە دەسەنێت و دەگاته لوتکه، که به سـەرکەوتنی یـەکێك لـەو دوو هێـزە، چیرۆکەکه به پایان دەگات.

جـا تـا چـەندێك هێـزی ململانـێ بـەهێز بێـت لـه نێـوان لایەنـەکانی چیرۆکەکەدا، هێندەش بەرگریی له نێوانیاندا زیاد دەکات، بەڵام لاوازیی ئەم هێزە و نەبوونی بەرگریی له وتووێژدا، بەڵگـه نییـه لەسـەر لاوازیـی بنیـاتی چـیرۆکەکه، بـەڵکو لەوانەیـه پێویسـت بێـت بـەو شـێوەیه رووداوەکان بڕۆن، بەهۆی بەهێزیی لایەنێکی ناو حیوارەکـە، لەبەرئـەوە له ناو قورئاندا چەند جۆرێك چیرۆك دەبینین، بەڵام سەرەتا بـا چـیرۆکه قورئانییـەکان لـه ڕووی حیـواری لـەم جۆرانـەوە، پـۆلێن بکـەین بـۆ چـیرۆکەکان (یـان دیمەنـەکان)ی پـێش زەمـان و مـەکان، واتـه کـاتی دروسـتکردنی گـەردوون و دواتـر، هـەروەها چـیرۆکەکانی سـەر زەوی و ژیـانی دونیـا، وه سـێهەمیش چـیرۆکەکان (یـان دیمەنـەکان)ی پـاش کۆتاییهاتنی ژیانی دونیا.

## یەکەم: چیرۆکەکانی پێش دروستبوونی کات و زەمەن:

١ـ هەندێکجار لەم چیرۆکانەدا بە هۆی بەهێزیی لایەنێکی ناو حیوار، هێزی بەرگرییکردن نامێنێت و هەر لە یەکەم دەرکەوتنی حیوارەکەوە گیانی تەسلیمبوون و ملکەچی بۆ لایەنی بەهێزی حیوارەکە، دەردەکەوێت. دیقەتی ئەم حیوارە بدە: ﴿ ثُمَّ اسْتَوَىٰ إِلَى السَّمَاءِ وَهِيَ دُخَانٌ فَقَالَ لَهَا وَلِلْأَرْضِ ائْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهًا قَالَتَا أَتَيْنَا طَائِعِينَ ﴾ (فصلت: ١١) واتە: (پاشان ویستی ئاسمان ڕێکبخات و دروستی بکات لەکاتێکدا کە دوکەڵ بوو، جا بە ئاسمان و زەوی فەرموو: فەرمانبەردار و ملکەچ بن، بە خۆشی خۆتان یان بە زۆر بتانخەمە ژێر دەسەڵاتی خۆمەوە؟! هەردوولا خێرا وتیان: ملکەچی تۆین و چۆن دەفەرمویت وا دەکەین)، حیوارێك لە نێوان پەروەردگاری بەهێزو بە توانا، لەگەڵ ئاسمان و زەوی، بەڵام ئەمەی دواییان هێزیان نییە و بەوەش ململانێ دروست نابێت، بەبێ بەرگرییکردن لایەنی دووەمی حیوار تەسلیم دەبێت و ملکەچ دەبێت، ئەوەش بە یەك وشە: ﴿ طَائِعِينَ ﴾.. ملکەچین..

یان سەیری ئەم حیوارە بکە: ﴿ وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِن بَنِي آدَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَىٰ أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ ۖ قَالُوا بَلَىٰ ۛ شَهِدْنَا ﴾ (الأعراف: ١٧٢) واتە: (یادی ئەو کاتەش بکەرەوە کە پەروەردگارت پشتاوپشتی نەوەی ئادەمی کۆکردەوە و کردنی بە شایەت بەسەر خۆیانەوە: ئایا من پەروەردگاری ئێوە نیم؟! هەموو وتیان: بەڵێ

شـايەتيمـان داوە "كـە تـۆ پـەروەردگارمانيـت"). لايـەنى يەكـەم: پەروەردگارى خاوەن توانا و بەهێز، لايـەنى دووەم: وەچـەكانى ئـادەم كە هێشتا لە جيهانى پەنهان و غەيبدا بوون.. دەبينين چيرۆكەكە درێژە ناكێشێت و زوو بە ڕێگاى ملكەچبوونى لايەنى دووەم يـەكلا دەبێتـەوە، حيوارەكـەش كـورت و پوختـە، بـە دوو وشـە كۆتـايى دێـت: ﴿بَلَىٰ شَهِدْنَآ﴾.. بەڵێ شايەتى دەدەين كە تۆ پەروەردگارمانيت..

بەڵام ئەگەر خواى گەورە بيەوێت بڕ و ميقدارێكى دياريكراو، بـڕاردە و پێداچوونەوە و ئيختيار، ببەخشێت بە لايەنى بەرانبەر، ئەوا شـێوازى حيوار و وتووێژەكە كەمێك دەگۆڕێت، وەك لە چيرۆكى دانانى جێنشيندا كە خواى گەورە تا ئاستێكى دياريكراو ئيختيارى داوە بە فريشـتەكان و ئەوانيش وەڵامى پەروەردگار دەدەنەوە و لە كۆتاييدا دەگەنـە حاڵـەتى تەسليمبوون و ملكەچى بۆ فەرمان و بڕيارەكەى خواى گەورە.

٢ـ بـەرز و نزمیـى ڕووداو، هەنـدێكجار پەيوەسـتە بـە بـار و هەسـتى قسەكەرەوە، هەر قسەيەكيش پاڵ بە ڕووداوەكەوە دەنێت بۆ گەيشتنە ترۆپكـى چـيرۆكەكە.. ديقـەت بفـەرموون بـۆ ئـەم چـيرۆكەى ئيبلـيس و بێفەرمانيكردنى پـەروەردگار لە كڕنووشبـردن بۆ ئـادەم: ﴿قَالَ يَٰٓإِبْلِيسُ مَا لَكَ أَلَّا تَكُونَ مَعَ ٱلسَّٰجِدِينَ ﴿٣٢﴾ قَالَ لَمْ أَكُن لِّأَسْجُدَ لِبَشَرٍ خَلَقْتَهُۥ مِن صَلْصَٰلٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ ﴿٣٣﴾ قَالَ فَٱخْرُجْ مِنْهَا فَإِنَّكَ رَجِيمٌ ﴿٣٤﴾ وَإِنَّ عَلَيْكَ ٱللَّعْنَةَ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلدِّينِ ﴿٣٥﴾ قَالَ رَبِّ فَأَنظِرْنِىٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿٣٦﴾ قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ ٱلْمُنظَرِينَ ﴿٣٧﴾ إِلَىٰ يَوْمِ

ٱلْوَقْتِ ٱلْمَعْلُومِ ﴿٣٨﴾ قَالَ رَبِّ بِمَآ أَغْوَيْتَنِى لَأُزَيِّنَنَّ لَهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٣٩﴾ إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿٤٠﴾ قَالَ هَٰذَا صِرَٰطٌ عَلَىَّ مُسْتَقِيمٌ ﴿٤١﴾ إِنَّ عِبَادِى لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَٰنٌ إِلَّا مَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلْغَاوِينَ ﴿٤٢﴾﴾ (الحجـر: ٣٢ - ٤٢). واته: (ئـەوسا خـوا فـەرمـووى: ئـەى ئیبلـیس، ئـەوە بـۆ لـەگـەڵ كڕنووشبەراندا نیت؟ شـەیتـان لـە وەڵامـدا وتـى: مـن ئـەوەنـدە (نـزم و بچووك) نەبووم كڕنووش بەرم بۆ بەشەرێك كـە تـۆ پێشـتر لـە قـوڕێكى ڕەشباو و ترشاو دروستتكردووە؟ خوا فەرمووى: كەواتە دەرچۆ لێـرە، چونكە بە ڕاستى تۆ نەفرینلێكراویت. بەڕاستى نەفرینى خوات بەردەوام لەسەرە هەتا ڕۆژى دوایى. شەیتان وتى: پەروەردگارا، مۆڵەتم بدە هەتا ئەو ڕۆژەى هـەمـووان زینـدوو دەكرێنـەوە. خـوا فـەرمـووى: دە تـۆ لـە مۆڵـەتـدراوانیت. تـا ڕۆژى كاتـە دیـاریكراو و زانـراوەكـە. ئیـبلس وتـى: پەروەردگارم، مادەم بە هۆى ئەم ئینسانەوە منـت سـەرلێشـێواو كـرد، شەرت بێت لـە زەویـدا هـەمـوو گوناهــ و لادان و تاوانێكیـان لا جـوان و شیرین بكەم و هەر هەموویان سەرلێشێواو و سەرگەردان بكـەم. بێجگـە لە بەندە پوختە و دڵسۆزەكانى خۆت نەبێت. خواى گەورە فەرمووى: ئا ئەوە ڕێگە و ڕێبازێكى ڕاست و دروستە، هەر بۆ لاى من دێت و هەر مـن چاودێرى دەكەم. بەڕاستى بـەنـدە چاك و پاكـەكـانى مـن بـە تـۆ فریـو نادرێن و تۆ هیچ دەسەڵاتێكت نییـە بـە سـەریانـدا، جگـە لـەوانـەى كـە شوێنت كەوتوون لە سەركەش و یاخى و سەرگەردانەكان).

دیقـەت بفـەرموون، سـەرەتا ئیبلـیس کـە سەرپێچـیی دەکـات لـە فەرمانەکە و بە نیازی کڕنووش نەبردنە بە خۆبەگەورەگرتنەوە دەڵێت: من کڕنووش نابەم بۆ مرۆڤێك کە لە قوڕ دروستت کـردووە، بـەڵام پـاش کەمێك لـە حیـوار و وتووێژەکـە سـەیر دەکـەین ئیبلـیس لاواز و ملکـەچ لەبەردەم پەروەردگاردا دەپاڕێتـەوە و دەلاڵێتـەوە بـە وشـەی "رب" و دەڵێت پەروەردگارم بمهێڵەرەوە تا ڕۆژی قیامەت، دووبـارە کـە خـوای گەورە داواکەی لێوەردەگرێت و ئەو هەلەی پێـدەدرێت، جـارێکی دیکـە گیانی خۆبەزلزانین دەیگرێتەوە و گیانی یاخیبوون تیایـدا دەبووژێتـەوە و ڕایدەگەیـەنێت کـە: دەبێـت نـەوەکانی ئـادەم بخەڵـەتێنم و سـەریان لێبشێوێنم.. ﴿ لَأُزَيِّنَنَّ لَهُمْ فِي الْأَرْضِ وَلَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴾.

## دووەم: چیرۆکەکانی سەر زەوی:

یەکەمین چیرۆك کە ڕووداوەکانی لەسەر زەویدا ڕوویداوە لە قورئاندا، چیرۆکی دوو کوڕەکەی ئادەمن (سەلامی خوای لێبێت). (جێی تێبینییە چـیرۆکێکی دیکـە لـە قورئانـدا هەیـە کـە لـەڕووی کاتـەوە پـێش ئـەم چیرۆکەی دوو کوڕەکەی ئادەمن، بەڵام زیاتر لە پەند دەچێت، نـەك لـە وتووێژ، ئەویش ئایەتی ٨٩ و ٩٠ی سوورەتی ـ الأعراف ـە).. چیرۆکەکە بەمشـــــێوەیەیە: ﴿ إِذْ قَرَّبَا قُرْبَانًا فَتُقُبِّلَ مِنْ أَحَدِهِمَا وَلَمْ يُتَقَبَّلْ مِنَ الْآخَرِ قَالَ لَأَقْتُلَنَّكَ قَالَ إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ اللَّهُ مِنَ الْمُتَّقِينَ (٢٧) لَئِنْ بَسَطْتَ إِلَيَّ يَدَكَ لِتَقْتُلَنِي مَا أَنَا بِبَاسِطٍ يَدِيَ إِلَيْكَ لِأَقْتُلَكَ إِنِّي أَخَافُ اللَّهَ رَبَّ الْعَالَمِينَ (٢٨) إِنِّي أُرِيدُ أَنْ تَبُوءَ

بِإِثۡمِي وَإِثۡمِكَ فَتَكُونَ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلنَّارِۚ وَذَٰلِكَ جَزَٰٓؤُاْ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾ (المائــــــدة: ٢٧ـ ٢٩) واته: (بەسەرهات و هەواڵی دوو کوڕەکەی ئادەم بۆ ئەو خەڵکە بخوێنەرەوە کە: بە ڕاستی ڕوویداوە، ئەوە بوو کاتێك هەردووکیان قوربانییان کرد، لە یەکێکیان وەرگیرا و لەویتریان وەرنەگیرا، بە براکەی وت: هەر دەتکوژم. ئەویش لە وەڵامی هەڕەشەکەیدا وتی: خوای گەورە تەنها لە پارێزکاران قوربانی و چاکە وەردەگرێت. سوێند بە خوا، ئەگەر تۆ دەست درێژ بکەیت بۆ من بۆ ئەوەی بمکوژیت، من دەست درێژ ناکەم بۆ تۆ، بۆ ئەوەی بتکوژم، چونکە بە ڕاستی من لە سزاو تۆڵەی خوا، پەروەردگاری جیهانەکان دەترسم. بە ڕاستی دەمەوێت بە گوناهی من و گوناهی خۆیشتەوە بگەڕێیتەوە، ئەوجا دەبیتە نیشتەجێی ناو ئاگر، هەر ئەوەشە پاداشتی ستەمکاران).. دیقەت بفەرموون بەڕێزان، لەم وتووێژەدا "قابیل"ی بکوژ تەنها یەك وشە دەڵێت، بەڵێ تەنها یەك وشە، بەڵام چ وشەیەك: (لَأَقۡتُلَنَّكَ)، بە کەسی بەرانبەری دەڵێت: دەتکوژم... بە درێژایی ئەوکاتەی کە کەسی بەرانبەری واتە "هابیل"ی برای، دەیەوێت هەست و سۆزی ڕابکێشێت و ترسی خوای دەخاتەوە بیر و یادی دۆزەخی دەخاتەوە، سا بەڵکو پەشیمان ببێتەوە، بەڵام ئەم بە کین و بوغزەوە گوێی لە قسەکانی هابیل گرتووە و هیچ ناڵێت، بەڵکو لە کۆتاییدا براکەی دەکوژێت و دەبێتە یەکەم ڕووداو لەسەر زەویدا، پاشان لەدوا نەمانی لایەنی یەکەمی حیوارەکە، قابیل پەشیمان

دەبێتەوە و قسەی دووەمی دەکات: ﴿ يَٰوَيۡلَتَىٰٓ أَعَجَزۡتُ أَنۡ أَكُونَ مِثۡلَ هَٰذَا ٱلۡغُرَابِ فَأُوَٰرِيَ سَوۡءَةَ أَخِيۖ ﴾ (المائدة: ٣١) واتە: (هاوار لە من، ئایا ئەوە من نەمتوانی وەکو ئەو قەلەڕەشە بکەم و بەقەدەر ئەوم لێنەهات تا لاشە و عەیب و عاری براکەم بشارمەوە)...

ئەوەی لەم چیرۆکەوە بەدی دەکرێت، خێرایی رووداوەکانە، کە هەر لە سەرەتاوە بەرەو لوتکە دەچێت، تیایدا ڕەگەزی شەڕ "قسەی کەمە و کرداری زۆرە" و ڕەگەزی چاکە بە زمانی کەسێکی ژیر و عاقڵ دەدوێت، بەڵام هەندێکجار قسەی ژیرانە سوودی نابێت! ئەمە جگە لەوەی کە وەسفکردنی بابەتەکە لە ڕێی گێڕانەوەوە کە لە ناوبڕی قسەکاندا هاتووە، لەوپەڕی کورتبڕیدایە و بە کورتترین وشە گوزارشتی لە زۆرترین واتا کردووە: ﴿ وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ ٱبۡنَيۡ ءَادَمَ بِٱلۡحَقِّ إِذۡ قَرَّبَا قُرۡبَانٗا فَتُقُبِّلَ مِنۡ أَحَدِهِمَا وَلَمۡ يُتَقَبَّلۡ مِنَ ٱلۡأٓخَرِ ﴾ (المائدە: ٢٧)، بەوپەڕی ئاسانی و سادەیی و بە وشەگەلێکی کەم گوێگر دەگەیەنێتە ناوجەرگەی ڕووداوەکانەوە، پاشان بە یەك وشە (لَأَقۡتُلَنَّكَۖ) دەمانگەیەنێتە لوتکەی خوێناویی چیرۆکەکە، هەناسە لەبەر گوێگر دەبڕێت بەوەی بزانێت کاردانەوەی بەرانبەر چییە، کە بە هێمنی و لەسەرخۆیی قسە دەکات و بەوەش هەناسەسواریی گوێگر کەمدەبێتەوە و هێور و دڵنیا دەبێتەوە، تا کۆتایی دێت.. پاشان جارێکی دیکە ڕۆڵی "گێڕانەوە" دێتە پێشەوە و باسی برا ستەمکارەکە دەکات و وشەی

﴿ فَطَوَّعَتْ ﴾ دەهێنێت (واتە دەروونی قابیل کوشتنی هابیلی لا شیرین کرد)، بەوەش بەیەك وشە باسی ئەو ململانێیەی کردووە کە لە دەروونی قابیلدا هەبووە، ئەگەرنا بەبێ هیچ پرۆسەیەکی "شیرینکردن" براکەی دەکوشت و دەبڕایەوە، هەروەها بەڵگەی ئەوەی قابیل لە ناخی خۆیدا لە ململانێدا بووە، ئەو پەشیمانییەیە کە دەستبەجێ پاش کوشتنی براکەی، بەسەریدا دێت.. "شیرینکردن"ی کوشتنی براکەی لە لایەن دەروونی خۆیەوە، بەڵگەیە لەسەر نەبوونی هیچ کاراکتەرێکی دەرەکی کە کاری تێکردبێت بۆ کوشتنی براکەی، وەك شەیتان بۆ نموونە.. هەروەها حیوارەکەش هیچ دەستوەردانێکی ڕەگەزی غەیبیی نامرۆیی تێدا نییە، جا چ خوای گەورە خۆی بێت، یان فریشتەکان، یان شەیتان، ئەمەش پێویستە بەو شێوەیە بێت تا بەڵگە بێت لەسەر "سەربەخۆبوونی مرۆڤ لەسەر زەوی و بەرپرسبوونی خۆی لە کارەکانی خۆی".

## سێهەم: ئەو چیرۆکانەی کە لە پاش ژیانی دونیا روو دەدەن:

ئەم چیرۆکانەش چەند بەشێکن، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی ئەوکاتە ئەم چیرۆکانە روو دەدەن کە هەموو شتێك کۆتایی هاتووە و هەرکەسە گەیشتووەتە سەرەنجامی خۆی، هەندێك دڵنیابوون لە چارەنووسی خۆیان و بەهەشت جێگەیانە، هەندێکی دیکەیان هێشتا ئومێدێکیان

مــاوه، هەنــدێکی دیکــەیان پــەتی ئومێــدیان پچــڕاوه و لەوپــەڕی پەشیمانیدان.

سەبارەت بە جۆری یەکەم کە ئەو کەسانەن گەیشتوونەتە بەهەشت، خەزنەدارانی بەهەشـت پێیانـدەڵێن: ﴿ سَلَٰمٌ عَلَيۡكُمۡ طِبۡتُمۡ فَٱدۡخُلُوهَا خَٰلِدِينَ ﴾ (الزمر: ٧٣)، واتە: (درووود و سڵاوتان لێبێت، ئێـوە پـاك و خاوێنن، کەواتە فەرموون بچنە ناو بەهەشـتەوە، هـاوڕێ لـەگـەڵ ژیـانی هەمیشـەیی و نـەبـڕاوەدا)، ئـەوانیش وەڵامیـان دەدەنـەوە: ﴿ وَقَالُواْ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي صَدَقَنَا وَعۡدَهُۥ وَأَوۡرَثَنَا ٱلۡأَرۡضَ نَتَبَوَّأُ مِنَ ٱلۡجَنَّةِ حَيۡثُ نَشَآءُۖ فَنِعۡمَ أَجۡرُ ٱلۡعَٰمِلِينَ ﴾ (الزمـر: ٧٤) واتــە: (ئـەوسـا دەڵـێن: سـوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی، کە بەڵێنی خۆی بۆمان بردەسەر و کـردینی بـە خاوەنی سەرزەمینی بەهەشت و لە هەر شـوێنێك و لـە هـەر جێیـەکیـدا بمانـەوێـت سـەربـەسـتانە ژیـان دەبـەینەسـەر، ئـای چـەنـدە پاداشـتی تێکۆشەران و خـەباتکـاران چـاك و پـاك و بـەنرخـە)، سـوپاس بـۆ ئـەو خوایەی کە بەڵێنەکانی خۆی بـەدیهێنا... هـەروەها فریشـتەکان پێیـان دەڵـــێن: ﴿ بُشۡرَىٰكُمُ ٱلۡيَوۡمَ جَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴾ (الحدیـد: ١٢) واتــە: (مـژدەی ئێـوە ئـەمـڕۆ باخـەکـانی بەهەشتە کە چەندەها ڕووبار بە ناویاندا دەڕوات، هاوڕێ لـەگـەڵ ژیـانی هەمیشەیی و نەبڕاوە تیایدا، ئا ئەوەیە سەرکەوتن و سەرفرازی گەورە و

بێ سنوور)، مژدەتان لێبێت لەم بەهەشتە.... هەروەها لە حیوارێکی دیکەدا دەڵێن: ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى هَدَىٰنَا لِهَٰذَا وَمَا كُنَّا لِنَهْتَدِىَ لَوْلَآ أَنْ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ لَقَدْ جَآءَتْ رُسُلُ رَبِّنَا بِٱلْحَقِّ ﴾ واتە: (سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە هیدایەت و ڕێنموویی کردین بۆ ئەم جێگە و ڕێگە خۆشە، ئەگەر ئەو خوایە هیدایەت و ڕێنموویی نەکردینایە هەرگیز ڕێگای هیدایەتمان نەدەزانی و ئەم پاداشتەمان وەرنەدەگرت، بە ڕاستی پێغەمبەرانی پەروەردگارمان بە حەق و ڕاستیەوە هاتن)... دواتر پێیان دەوترێت: ﴿ تِلْكُمُ ٱلْجَنَّةُ أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾ (الاعراف: ٤٣) واتە: (ئەوە ئەو بەهەشتەیە کە پێتاندراوە بە هۆی ئەو کار و کردەوانە کە ئەنجامتان دەدا).

## ئەوەی جێی تێبینییە لەم حیوارانەی ئەهلی بەهەشتدا، ئەمانەیە:

١ـ حیواری هەردوولا، فریشتەکان و ئەهلی بەهەشت، زیاتر دەربڕینی ئاشتی و دڵنیایی و هێمنییە، کە ئیتر هیچ ترس و بیمێك نەماوە لە دوایەوە، وە بێخەم بوون و کۆتایی هەموو شتێك هاتووە.

٢ـ ئەم حیوارانە، زیاتر وەك حیوارەکانی جۆری یەکەمی ئەو چیرۆکانەی ئاسمانە، کە لە بارەی دروستکردنی گەردوون و خەڵقی ئادەم و دانانی جێنشینەوە باسمانکرد، کە هەمووی تەسلیمبوون و ملکەچبوونە بۆ پەروەردگار، کە دەنگی کەسێکە بەڵێنی شتێکی

پێدرابێت و دواتر به زیادەوە بەڵێنەکەی بینیبێتەوە، لەبەرئەوە دەڵێت: الحمد لله... ئەم ملکەچبوونە ئاسانتر و سادەتر دێتە پێشەوە بە بەراورد بەو ملکەچبوونەی کە لە چیرۆکەکانی پۆلێنی یەکەمدا باسکران لە خەڵقی ئادەم و دانانی جێنشیندا.

سەبارەت بە جۆری دووەم، کە ئەو کەسانەن کە ئەهلی دۆزەخن، زیاتر حیوارەکە لە نێوان ئەهلی دۆزەخ لە لایەك و فریشتەکان و ئەهلی ئەعراف (لە نێوان بەهەشت و دۆزەخدا) و ئەهلی بەهەشتدایە، واتە کاراکتەری سەرەکی تیایاندا ئەهلی دۆزەخە لە بەرانبەر فریشتەکان و ئەهلی ئەعراف و ئەهلی بەهەشتدا.. هەموویشی زیاتر گیانی پەشیمانی و ئاواتخواستنی بێسوود زاڵە بەسەر حیوارەکاندا: ﴿رَبَّنَآ أَخۡرِجۡنَا نَعۡمَلۡ صَٰلِحًا غَيۡرَ ٱلَّذِي كُنَّا نَعۡمَلُ﴾ (فاطر: ٣٧) واتە: (خوایە دەرمانبهێنە لە دۆزەخ مەرج بێت کاری چاکە بکەین... )، پەروەردگاریش پێیان دەفەرموێت: ﴿أَلَمۡ تَكُنۡ ءَايَٰتِي تُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ فَكُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ﴾ (المؤمنون: ١٠٥)، واتە: (ئایا ئایەتەکانی من نەدەخوێنرانەوە بۆتان، بەڵام ئێوە بە درۆتان دەزانی؟).. پاشان هاوار بۆ خوا دەبەن و دەڵێن: ﴿قَالُواْ رَبَّنَا غَلَبَتۡ عَلَيۡنَا شِقۡوَتُنَا وَكُنَّا قَوۡمٗا ضَآلِّينَ ١٠٦ رَبَّنَآ أَخۡرِجۡنَا مِنۡهَا فَإِنۡ عُدۡنَا فَإِنَّا ظَٰلِمُونَ ١٠٧ قَالَ ٱخۡسَـُٔواْ فِيهَا وَلَا تُكَلِّمُونِ ١٠٨﴾ (المؤمنون: ١٠٦ـ ١٠٨)، واتە: (دەڵێن: پەروەردگارا نەگبەتی و نەهامەتی (بەدبەختی و نەگبەتیمان) سەرشانی گرتین و زاڵ بوو

بەسەرماندا ئێمە کەسانێکی گومڕا بووین. پەروەردگارا لە ناو ئاگری دۆزەخ و سزاکەیدا دەرمان بهێنە ئەگەر جارێکی تر گەڕاینەوە (بۆ گومڕایی) ئەوە ئیتر دیارە کە ئێمە کەسانێکی ستەمکارین. خوای گەورە لە وەڵامیاندا دەفەرموێت: بێ دەنگ بن و دەمتان داخەن، قسەشم لە گەڵدا مەکەن....). ئیتر بەمشێوەیە زەلیل دەبن (وەك لە سوورەتی قەلەم و مەعاریجدا باسیان کراوە)، هیچ کارێکی چاکەیان نەکردووە تا مردن یەخەی گرتوون (سوورەتی موددەسیر: ٤٦)، پەشیمانی دایاندەگرێت (سوورەتی یونس: ٥٤، سەبەء: ٣٣)، تا دەگاتە ئەوەی ناکۆکی دەنێنەوە و قسە دەکەن و ژاوەژاو دەنێنەوە لەکاتێکدا پێیانوتراوە قسە نەکەن: ﴿ هَٰذَا يَوْمُ لَا يَنطِقُونَ ﴿٣٥﴾ وَلَا يُؤْذَنُ لَهُمْ فَيَعْتَذِرُونَ ﴾ (المرسلات: ٣٦) واتە: (ئەمڕۆ ئیتر ئەو ڕۆژەیە کە قسەیان نەماوە و ورتەیان لێنایەت. مۆڵەتیش نادرێن پاکانە بکەن)، هەر لەبەر ئەو قسە و ناکۆکییانەیە کە ئەهلی دۆزەخ بە ئەهلی موناقەشە و دەمەدەمێ ناسراون: ﴿ إِنَّ ذَٰلِكَ لَحَقٌّ تَخَاصُمُ أَهْلِ النَّارِ ﴾ (ص: ٦٤)، لەکاتێکدا ئەهلی بەهەشت: ﴿ لَا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا وَلَا تَأْثِيمًا ﴿٢٥﴾ إِلَّا قِيلًا سَلَامًا سَلَامًا ﴿٢٦﴾ ﴾ (الواقعة: ٢٥_ ٢٦) واتە: (هیچ جۆرە قسەیەکی نابەجێ و نادروست و ناڕێك نابیستن و یەکتریش گوناهبار ناکەن، جگە لە وتنی سڵاو و وەڵامدانەوە و قسەی خۆش نەبێت)، ﴿ لَّا يَسْمَعُونَ فِيهَا

لَغْوًا إِلَّا سَلَٰمًا ﴾ (مريم: ٦٢) واته: (ئەوسا لەوێ هیچ گوفتارێکی نابەجێ نابیستن، جگە لە سڵاوکردن)، ﴿ تَحِيَّتُهُمْ فِيهَا سَلَٰمٌ ﴾ (یونس: ١٠) واتە: (چاك و چۆنیشیان لەوێ سەلامکردنە). هەموو قسە و باسیان هەر ئاشتی و سڵاو و هێمنی و قسەی جوان و ڕێکوپێکە... کەواتە ڕەگەزی "بەرگرییکردن" کە هۆکاری دروستکردنی ململانێی ناو چیرۆکە بە گشتی، لە ناو ئەهلی بەهەشتدا بەدی ناکرێت، قورئانی پیرۆز لە چیرۆکەکانیدا لە بارەی ئەهلی بەهەشت هەمیشە بە کەسانێکی هێمن و لەسەرخۆ و ڕازی و دڵنیا باسیان دەکات، لە بەرانبەردا ئەهلی ئاگر هەمیشە لە ململانێ و نائۆقرەییدان...

**سەرنجێك:**

هەندێکجار لە ناوەڕاستی چیرۆکدا، دیمەنێکی باسکردن "وەسف" دێتە پێشەوە، ئەم دیمەنە هەڵگری جۆرەها کاریگەرییە لەسەر ڕێڕەوی گشتیی چیرۆکەکە، بۆ نموونە لە چیرۆکی نووح و کوڕەکەیدا لە کاتی لافاوەکەدا، چەند حیوار و وتووێژێك لە نێوانیاندا ڕوودەدات و دواتر کوڕەکەی دەخنکێت و پاشان دوای لافاوەکە نووح تکا لە خوا دەکات کە کوڕەکەیشی لە خانەوادەی خۆی بووە بۆچی خنکا و پاشان وەڵامی پەروەردگاری بۆ دێتەوە لەو بارەوە... بەڵام لە ناو ئەم حیوارە زۆرانەدا، یەك ئایەت وەك دیمەنێکی باسکردن "وەسف"ی ڕەوشەکە هەیە کە ئەوپەڕی کاریگەریی لەسەر ڕێرەوی ڕووداوەکان لە ناو

چیرۆکەکەدا، داناوە. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَقِيلَ يَٰٓأَرۡضُ ٱبۡلَعِي مَآءَكِ وَيَٰسَمَآءُ أَقۡلِعِي وَغِيضَ ٱلۡمَآءُ وَقُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ وَٱسۡتَوَتۡ عَلَى ٱلۡجُودِيِّۖ وَقِيلَ بُعۡدٗا لِّلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٤﴾ ﴾ (هود: ٤٤) واتە: (ئەوجا گوترا زەمین ئاوت هەڵقورێنە، بەرزایی بەس ببارێنە، ئاو ڕۆچوو بە ناخی ئاخدا، کار سەری گرت، لەسەر جودی لەنگەری گرت، ئەوجا گوترا: تارن ئەوانەی ناهەقیکارن)... بۆ لەناو ئەو حیوار و وتووێژە زۆرانەدا ئەم دیمەنی باسکردن و گێڕانەوەیە دێتە ناوەوە؟ لەبەر دوو هۆ: یەکەم: ڕوونکردنەوەی توانا و قودرەتی خوای پەروەردگار لە کۆتاییهێنان بەم ناڕەحەتی و شڵەژاوییەی دونیا، بە هۆی لافاوەکەوە، تەنها بە چەند وشەیەکی کەم... (يَٰٓأَرۡضُ) (وَيَٰسَمَآءُ).. وەك جەختکردنەوە لەسەر توانا و هێزی خۆی لە وشەکانی "کن فیکون"دا..

دووەم: ئەم دەستەواژە کورت و پوختانە، بۆ بازدانە بەسەر ئەو کارەساتە قورس و گرانانەی کە لافاوەکە هێناویەتی، وەك بڵێی هیچ نییە، واتە هەموو ئەو کارەساتەی لافاوەکە دروستیکردووە، شتێکی هیچە و بەیەك وشە کۆتایی پێدێت.. ئەوەی گرنگە بەشەکانی دیکەی ڕووداوەکەیە کە سەلمێنەری ئەوەیە ئیمان لە باوك و کوڕێتی گرنگترە، با نووح، پێغەمبەر بێت، کە کوڕەکەی بێباوەڕ بوو، پەیوەندییەکە دەپچڕێت.

هەروەها دەرخەری ئەوەیە کە پێغەمبەرانیش چەندە قوربانییان داوە لە پێناو ئەم ئاینەدا، چەندە ماندووبوون، چەندە ئازاریان چەشتووە، وە تۆش ئەی محەممەد ئارام بگرە لەسەر ئەو ناڕەحەتییانە وەك چۆن ئەوان ئارامیان گرت... واتە کارەساتی لافاوەکە، هیچ نییە بەرانبەر بەو ڕووداوە گرنگانەی دیکە کە لە ناو چیرۆکەکەدا هاتوون.

لە لایەکی دیکەوە با بپرسین، ئەم ڕستەیە، کە لەناوبڕی چیرۆکەکەدا هاتووە، بۆچی باسکراوە؟ بۆ درێژە بە چیرۆکەکە نەدراوە بەبێ ئەم دێڕە؟ لە وەڵامدا دەڵێین: باسنەکردن و لابردنی ئەم دێڕە دەبووە هۆی تێکدانی چیرۆکەکە، لە چەند ڕوویەکەوە: لە لایەکەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کارەساتی لافاوەکە چ بە گەورەبوونی و چ دواتر بە نەمان و کۆتاییهاتنی، کارەساتی کوڕەکەی لە بیری نووح پێغەمبەر نەبردەوە و هەر باسی دەکرد تا خوای گەورە پێی فەرموو: ئەو لە خانەوادەی تۆ نییە.. بەوەش پەردە بەسەر ئەو دیمەنەدا دادەدرێتەوە...

لە لایەکی دیکەوە، ئەگەر ئەم دێڕە باسنەکرایە، کەس نەیدەزانی ئەو هەموو ئاوە کە بووە هۆی دروستبوونی لافاوەکە، چی لێهات؟ ئەی کەشتییەکە چی لێهات؟ بەڵام بەم چەند دەستەواژە کورت و پوختە، وەڵامی هەموو ئەو پرسیارانەی داوەتەوە و سوودیشی بە ڕێڕەوی ڕووداوەکان گەیاندووە.

# بەشی دووەم

# بازدان بە رووداو لەڕێی تێپەڕاندنی کات و شوێنەوە

هەندێك چیرۆك هەیە لە قورئانی پیرۆزدا، تایبەتمەندیی خۆی هەیە، ئەوەش بریتییە لە: بڕینی دیمەنێکی چیرۆکەکە و بردنی خوێنەر بۆ دیمەنی دیکەی دواتری، کە لە ڕووی کات و شوێن "زەمان و مەکان"ـەوە نێوانیان زۆرە. واتە گواستنەوە لە دیمەنی یەکەمەوە یەکسەر و دەستبەجێ بۆ ناو ڕووداوەکانی دیمەنی سێهەم، بە جۆرێك دیمەنی دووەم، واتە هەموو کات و شوێن، دەپێچێتەوە و دەیخاتە لاوە و خوێنەر دەگوازێتەوە بە جۆرێك کە هەستناکات هیچ شتێك لە رووداوەکە قرتابێت، یان کەموکورییەك لە گێڕانەوەکەدا هەبێت. واتە کۆتایی دیمەنی یەکەم، دەبێتە سەرەتای دیمەنی سێهەم و خوێنەر بە شێوەیەکی لەپڕ (موفاجیئ - سورپرایز) دەپەڕێتەوە بۆ دیمەنی سێهەم.

## یەکەم: بازدان بە تێپەڕاندنی "شوێن":

**نموونەی یەکەم:** دیارترین نموونەی لەم جۆرە، چیرۆکی سەروەرمان مووسایە لە سوورەتی "طـه"، دیمەنی یەکەمی چیرۆکەکە: لە دۆڵی پیرۆزی "طوی" "الوادی المقدس" ڕوودەدات، کە تیایدا وتووێژێکی درێژ لە نێوان مووسا (سەلامی خوای لێبێت) لەگەڵ پەروەردگاری بەرز و بڵندا ڕوودەدات.

دیمەنی دووەم: ڕۆیشتنی مووسایە بۆ میسر و بە دیدار شادبوونەوەی هاروونی برای و بەیەکەوەچوونیان بۆ لای فیرعەون.

دیمەنی سێهەم: ڕووداوەکانی کۆشکی فیرعەونە، کە وتووێژی نێوان مووسا و هاروون لە لایەك و فیرعەون لە لایەکی دیکەوە، ڕوودەدات..

بەڵام دەبینین لە ئایەتەکاندا، دیمەنی دووەم باسنەکراوە و ڕاستەوخۆ کۆتایی دیمەنی یەکەم کراوە بە سەرەتای دیمەنی سێهەم، بەبێ هەستکردن بە پچڕانی چیرۆکەکە.

ئەنجا با سەیرێکی ئایەتەکان بکەین: ﴿ ٱذْهَبْ أَنتَ وَأَخُوكَ بِـَٔايَٰتِى وَلَا تَنِيَا فِى ذِكْرِى ﴿٤٢﴾ ٱذْهَبَآ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ﴿٤٣﴾ فَقُولَا لَهُۥ قَوْلًا لَّيِّنًا لَّعَلَّهُۥ يَتَذَكَّرُ أَوْ يَخْشَىٰ ﴿٤٤﴾ قَالَا رَبَّنَآ إِنَّنَا نَخَافُ أَن يَفْرُطَ عَلَيْنَآ أَوْ أَن يَطْغَىٰ ﴿٤٥﴾ قَالَ لَا تَخَافَآ ۖ إِنَّنِى مَعَكُمَآ أَسْمَعُ وَأَرَىٰ ﴿٤٦﴾ فَأْتِيَاهُ فَقُولَآ إِنَّا رَسُولَا رَبِّكَ فَأَرْسِلْ مَعَنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ وَلَا تُعَذِّبْهُمْ ۖ قَدْ جِئْنَٰكَ بِـَٔايَةٍ مِّن رَّبِّكَ ۖ وَٱلسَّلَٰمُ عَلَىٰ مَنِ ٱتَّبَعَ ٱلْهُدَىٰٓ ﴿٤٧﴾ إِنَّا قَدْ أُوحِىَ إِلَيْنَآ أَنَّ ٱلْعَذَابَ عَلَىٰ مَن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ ﴿٤٨﴾ قَالَ فَمَن رَّبُّكُمَا يَٰمُوسَىٰ ﴿٤٩﴾ قَالَ رَبُّنَا ٱلَّذِىٓ أَعْطَىٰ كُلَّ شَىْءٍ خَلْقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ﴿٥٠﴾ قَالَ فَمَا بَالُ ٱلْقُرُونِ ٱلْأُولَىٰ ﴿٥١﴾ قَالَ عِلْمُهَا عِندَ رَبِّى فِى كِتَٰبٍ ۖ لَّا يَضِلُّ رَبِّى وَلَا يَنسَى ﴿٥٢﴾ ﴾ (سوورەتی طه: ٤٢ـ ٥٢) واتە: (دەی بڕۆ خۆت و براکەت هاوڕێ لەگەڵ موعجیزەکانمدا، نەکەن لە گەیاندنی پەیامی مندا سستی و خاوی بکەن. هەردووکتان بچن بۆ لای فیرعەون، چونکە بە ڕاستی ئەو لە سنوور دەرچووە و لە مەرزی بەندایەتی ترازاوە. هەردووکتان بە نەرمی و جوانی گفتوگۆی لەگەڵدا بکەن، بۆ

ئەوەی یاداوەری وەربگرێت، یان ترسی (سزای ئێمە) لە دەروونیدا جێ بگرێت. مووسا و هاروون وتیان: پەروەردگارا! ئێمە بە ڕاستی دەترسین پەلامارمان بدات و لەناومان بەرێت (پێش ئەوەی پەیامەکەتی پێڕابگەیەنین)، یان زیاتر سەرکەشیی بکات. خوای گەورە فەرمووی: مەترسن من بەڕاستی لەگەڵتاندام، دەبیستم و دەبینم. جا بچن بۆ لای و پێیبڵێن: ئێمە هەردووکمان لە لایەن پەروەردگاری تۆوە ڕەوانە کراوین، (باوەڕی پێ بهێنە) و نەوەی ئیسرائیلیش ئازاد بکە، با لەگەڵماندا بن، سزا و ئازاریان مەدە، بەڕاستی ئێمە، هاوڕێ لەگەڵ موعجیزەی تایبەتی لە لایەن پەروەردگارتەوە ڕەوانەکراوین، سڵاویش لەسەر ئەو کەسانە بێت کە شوێنی هیدایەت و ڕێبازی ڕاستەقینە کەوتوون. بێگومان ئێمە ئاگادارکراوین، کە سزا و ئازار و بەڵا، لەسەر ئەوانەیە کە ڕاستییەکان بە درۆ دەزانن و پشتی تێدەکەن و لێی یاخی دەبن. فیرعەون بە فیزەوە وتی: باشە ئەی مووسا پەروەردگاری ئێوە کێیە؟ مووسا وتی: پەروەردگارمان ئەو زاتەیە کە هەموو شتێکی بەتایبەتی و ڕێکوپێکی دروست کردووە، پاشان ڕێنموویی کردووە، تا بە چاکی دەوری خۆی ببینێت. فیرعەون وتی: ئەی ئەو هەموو خەڵکەی کە لەوەوپێش تیاچوون، چیان لێهات و سەرەنجامیان چۆنە؟ مووسا وتی: زانیاری ئەوانە، لای پەروەردگارمە و لە دۆسیەکانی (لوح المحفوظ)دا پارێزراوە، پەروەردگاری من، هیچی لێ ون نابێت، هیچ شتێکیش فەرامۆش ناکات). دیقەت بدەن وتووێژی نێوان مووسا و فیرعەون لە شوێنێکی

دیکە و لە کاتێکی دیکەدا دەستپێدەکات، لەکاتێکدا هێشتا بە باشی لە ڕووداوەکانی دیمەنی یەکەم تێنەگەیشتووین، کە لە سینا ڕوودەدات.

**ئەوەی تێبینی دەکەین لەم چیرۆکەدا دوو شتە:**

١ـ ئاڕاستەی قسەکردن لە دیمەنی یەکەمدا بەرەو ڕووی مووسایە و شوێنەکەش سینایە، ئایا ئێستا هاروون لە کوێیە؟ ئەو لە شوێنێکە لە میسر، مووسا و هاروون چەند ساڵێکە لە یەك دابڕاون (دە ساڵ)، لەگەڵ ئەوەشدا مووسا داوا لە خوا دەکات هاروونی برای بکات بە وەزیری، پەروەردگاریش وەڵامی دەداتەوە و دەیکاتە وەزیر و پێغەمبەر، ئەمەش بەخششێکی خواییە کە زۆرمان درکی پێناکەین، ئەوەش ئەوەیە تەنها وەڵامدانەوەی نزاکەی مووسا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە هاروونی برای ماوە و سەلامەتە – لەکاتێکدا دە ساڵە ئاگای لە هەواڵی نییە –، ئەگەرنا پەروەردگار داواکەی بۆ جێبەجێ نەدەکرد.. هەموو ئەمانە لە دیمەنی یەکەمدا کە هاروونی تێدا نییە، ڕوویدا، دەی ئایا چۆن ئاڕاستەی قسەکردنەکە کتوپڕ گۆڕدرا بۆ هەردووکیان: مووسا و هاروون و وەڵامەکەیش وەڵامی هەردووکیانە: ﴿ قَالَا رَبَّنَآ إِنَّنَا نَخَافُ أَن يَفْرُطَ عَلَيْنَآ أَوْ أَن يَطْغَىٰ ﴿٤٥﴾ ﴾... ئایا ئەمە بەڵگە نییە لەسەر ئەوەی کە دیمەنێك لەم نێوانەدا هەیە کە دەکەوێتە کۆتایی دیمەنی یەکەم و سەرەتای دیمەنی سێهەم، وە کاتێکی خایاندووە کە تەنها خوا خۆی دەزانێت چەندە، کە تیایدا مووسا گەشتە دوور و درێژەکەی بۆ میسر تەواو دەکات و لەوێ بە دوای براکەیدا دەگەڕێت و پەیامەکەی پێ

ڕادەگەیەنێت کە بووەتە پێغەمبەر و پاشان هەردووکیان ڕوویانکردووەتەوە پەروەردگار و کەوتوونەتەوە وتووێژ لەگەڵیدا، کە تەنها یەك بەشی ئەم وتووێژە لەتکراوە و هێنراوەتەوە ناو دیمەنەکە، کە بەشی یەکەمی دەکەوێتە چوارچێوەی فەرمانی ئیلاهیی: ﴿ ٱذۡهَبَآ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ﴾، بەشی کۆتاییشی دەکەوێتە ناو قسەی هەردووکیان: مووسا و هاروون: ﴿ إِنَّا قَدۡ أُوحِيَ إِلَيۡنَآ أَنَّ ٱلۡعَذَابَ عَلَىٰ مَن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ ﴾، کە فەرمانیان پێکرا ئەم قسەیە بگەیەننە فیرعەون. سوودی یەکەمی وەرگیراو ئەوەیە کە ئەو دوو دیمەنەی باسکران، دیمەنێکی دیکەی لێفەراهەم بووە کە لە وتووێژەکانەوە ڕووداوەکانیمان بۆ دەردەکەوێت.

٢ـ ئەو داوایەی کە خوای پەروەردگار لە دوو براکە: "مووسا و هاروون"ی کرد لە دیمەنی باسکراودا، بە فەرموودەی: ﴿ إِنَّا قَدۡ أُوحِيَ إِلَيۡنَآ أَنَّ ٱلۡعَذَابَ عَلَىٰ مَن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ ﴾، تەواوبوو، ئایەتی دواتری ڕاستەوخۆ بە وەڵامی فیرعەون دەستپێدەکات: ﴿ قَالَ فَمَن رَّبُّكُمَا يَٰمُوسَىٰ ﴾، و بە دوایدا وتووێژەکە درێژەی هەیە لە نێوان مووسا و فیرعەوندا، بەڵام ئایا فیرعەون لە کوێی ئەو دیمەنەدا بوو کە مووسا و هاروون لەگەڵ پەروەردگاردا وتووێژیان دەکرد؟ فیرعەون لە جیهانی خۆیدا بوو، هیچ ئاگای لە هاتنی مووسا و هاروون نەبووە بۆ لای، بەڵام

خوێنـەر ئـەو "بازدانـە" دەبینێـت کـە ڕاسـتەوخۆ لـە دیمەنێکـەوە دەیگوازێتەوە بۆ دیمەنێکی دیکە، کە دووریی و کات لـەو گواسـتنەوەدا نامێنێـت و ڕووداوەکـە دەگاتـە زیـاتر ئـاڵۆزبوون، کـە کتـوپڕ مووسـا و هاروون لەبەردەم فیرعەوندا دەبینینەوە.

پاشان کاتێك پەروەردگار بە مووسا و هاروون دەفەرموێت چی بڵـێن بـە فیرعـەون ﴿ فَأْتِيَاهُ فَقُولَآ إِنَّا رَسُولَا رَبِّكَ فَأَرْسِلْ مَعَنَا بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ وَلَا تُعَذِّبْهُمْ ۖ قَدْ جِئْنَٰكَ بِـَٔايَةٍ مِّن رَّبِّكَ ۖ وَٱلسَّلَٰمُ عَلَىٰ مَنِ ٱتَّبَعَ ٱلْهُدَىٰٓ ﴿٤٧﴾ إِنَّا قَدْ أُوحِىَ إِلَيْنَآ أَنَّ ٱلْعَذَابَ عَلَىٰ مَن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ ﴿٤٨﴾ ﴾) بە دوایدا یەکسەر وەڵامی فیرعەون دێت، واتە بەشی یەکەم لە دیمەنەکە هێشتا وتووێـژی نێوان پـەروەردگار لـە لایـەك و مووسـا و هاروونـە لـە لایـەکی دیکـەوە، لێـرەدا "بـازدان"ی دووەم هەیـە، ئـەویش ئەوەیـە: پـاش وتووێژەکـە، مووسا و هاروون دەچنە لای فیرعەون و قسەکان وەك خۆی، بێ زیـاد و کـەم، بـە فیرعـەون دەگەیـەنن و پاشـان فیرعـەون وەڵام دەداتــەوە و دەڵێـت: ﴿ قَالَ فَمَن رَّبُّكُمَا يَٰمُوسَىٰ ﴿٤٩﴾ ﴾، ئەمــەش بەڵگەیــە لەســەر ئــەوەی مووســا و هــاروون، داواکــەی پــەروەردگاریان بیســت و لێــی تێگەیشتن و هەموو ڕێگر و بەربەستەکانیان بڕی و چوونە لای فیرعـەون و قسەکانیان پێگەیاند.. وەڵامی فیرعـەونیش یەکسـەر باسـکراوە.. بـە جۆرێك کە خوێنەر نازانێت ئەو گوزارشتە، سـەر بـەکام دیمەنـە، ئەگـەر لەگـەڵ دیمـەنی یەکەمـدا دایبنـێین، ئـەوە تـەواوە و لـە فـەرموودەی

پـەروەردگارە، ئەگـەریش بیبەسـتینەوە بـە دیمـەنی دووەمـەوە، هـەر تەواوە و دەبێتە قسـەی مووسـا و هـاروون بـۆ فیرعـەون، وە بەڵگەشـە لەسەر ڕاستگۆیی مووسا و هاروون لە گەیاندنی پەیامەکەدا.

**نموونەی دووەم:** هەمان دیمەنی بازدان لە چیرۆکی مووسا و فیرعەون لە سوورەتی (الشعراء): ﴿ قَالَ كَلَّا فَٱذْهَبَا بِـَٔايَٰتِنَآ إِنَّا مَعَكُم مُّسْتَمِعُونَ ﴿١٥﴾ فَأْتِيَا فِرْعَوْنَ فَقُولَآ إِنَّا رَسُولُ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٦﴾ أَنْ أَرْسِلْ مَعَنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿١٧﴾ قَالَ أَلَمْ نُرَبِّكَ فِينَا وَلِيدًا وَلَبِثْتَ فِينَا مِنْ عُمُرِكَ سِنِينَ ﴿١٨﴾ وَفَعَلْتَ فَعْلَتَكَ ٱلَّتِى فَعَلْتَ وَأَنتَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿١٩﴾ قَالَ فَعَلْتُهَآ إِذًا وَأَنَا۠ مِنَ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٢٠﴾ ﴾ (الشـعراء: ١٥ــ ٢٠) واتـە: (خوا فەرمووی: نەخێر (ناتوانن بتکـوژن)، کـەواتـە بـڕۆن هـەردووکتـان هاوڕێ لەگەڵ موعجیزەکانماندا، ئێمە بەڕاستی لەگەڵتانداین و چاودێر و گوێگرین. بچن بۆ لای فیرعـەون و بڵـێن: ئێمـە بـەڕاسـتی هـەردووکمـان نێردراوی پەروەردگاری جیهانیانین. داوات لێدەکەین کە دەستبەرداری نەوەی ئیسرائیل ببیت و ئازادیان بکەیت با لەگەڵ ئێمەدا بن. فیرعـەون بە مووسای وت: (ئەمە پاداشتی پیاوەتییـە) ئایا ئێمـە بـە منـداڵی بـە خێومان نەکردیت؟ چەندەها ساڵی تەمەنت لەناوماندا نـەبـردەسـەر؟!. ئەوەشت کرد کە کردت (مەبەست کوشتنی قیبتیەکەیە) دیارە کە تۆ لە ڕیزی ئەو کەسانەدایت کـە ناشـکورن و پاداشـتی پیـاوەتـی نـازانن... مووسا وتی: ئەو کاتە ئەوەمکرد، لە نەزانەکان بـووم)... خـوای گـەورە پێیـان دەفـەرموێت بچـنە لای فیرعـەون و پێـی بڵـێن: ئێمـە نێـردراوی

پەروەردگاری جیهانیانین و نەوەی ئیسرائیلمان لەگەڵدا بنێرە و ئازادیان بکە، لێرەدا بازدانەکە روو دەدات و دیمەنی چوونی مووسا و هاروون و گەیاندنی پەیامەکە وەك خۆی، بازی بەسەردا دراوە و یەکسەر وەڵامی فیرعەون دێت: ئایا ئێمە تۆمان بەخێو نەکرد...

## نموونەی سێهەم:

بە نموونەیەکی دیکەی سوورەتی یوسف درێژە بەم بابەتە دەدەین، دیمەنی یەکەم: کاتی گەڕانەوەی براکانی یوسفە لە میسرەوە بۆ لای باوکیان، کاتێك بنیامینی برایان لە دەستداوە و لای یوسف گل دراوەتەوە بە تاوانی "دزی"، خەم و خەفەت دایگرتوون لە لایەك بۆ چارەنووسی براکەیان و لە لایەکی دیکەوە لە خەمی ئەوەی بەبێ براکەیان بگەڕێنەوە بۆ لای باوکیان، دەبێت چی روو بدات.

لێرەدا کە براکان دەگەڕێنەوە، برا گەورەکەیان لەگەڵیان ناڕواتەوە بۆ لای باوکیان و بە هۆی ئەوەی کە بنیامینیان لەدەستداوە، رووی نایەت بڕواتەوە، برا گەورەکەیان پێیاندەڵێت: ﴿ فَلَمَّا ٱسۡتَيۡـَٔسُواْ مِنۡهُ خَلَصُواْ نَجِيًّاۖ قَالَ كَبِيرُهُمۡ أَلَمۡ تَعۡلَمُوٓاْ أَنَّ أَبَاكُمۡ قَدۡ أَخَذَ عَلَيۡكُم مَّوۡثِقًا مِّنَ ٱللَّهِ وَمِن قَبۡلُ مَا فَرَّطتُمۡ فِي يُوسُفَۖ فَلَنۡ أَبۡرَحَ ٱلۡأَرۡضَ حَتَّىٰ يَأۡذَنَ لِيٓ أَبِيٓ أَوۡ يَحۡكُمَ ٱللَّهُ لِيۖ وَهُوَ خَيۡرُ ٱلۡحَٰكِمِينَ ۝٨٠ ٱرۡجِعُوٓاْ إِلَىٰٓ أَبِيكُمۡ فَقُولُواْ يَٰٓأَبَانَآ إِنَّ ٱبۡنَكَ سَرَقَ وَمَا شَهِدۡنَآ إِلَّا بِمَا عَلِمۡنَا وَمَا كُنَّا لِلۡغَيۡبِ حَٰفِظِينَ ۝٨١ وَسۡـَٔلِ ٱلۡقَرۡيَةَ ٱلَّتِي كُنَّا

فِيهَا وَٱلْعِيرَ ٱلَّتِىٓ أَقْبَلْنَا فِيهَا ۖ وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ ﴿٨٢﴾ قَالَ بَلْ سَوَّلَتْ لَكُمْ أَنفُسُكُمْ أَمْرًا ۖ فَصَبْرٌ جَمِيلٌ ۖ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَأْتِيَنِى بِهِمْ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٨٣﴾ ﴾

(يوسف: ٨٠ــ ٨٣) واتــه: (كاتێـك كـه نائومێـد بـوون لـه پاشـا، لـه كەنارێكەوە بۆ خۆيان دەستيانكرد بە چپە و ڕاگۆڕينەوە، گەورەكەيـان وتی: باشە، ئەی نەتانزانی كە بێگومان باوكتان بەڕاستی پەيمانێكی لیٚ وەرگرتوون و خواشـی كـردووە بـە شـايەت بـەسـەرتانـەوە، پێشـتريش ئاشـكرايە كـە چيتان كـرد بـە يوسـف و پيلانتـان گێـڕا دژی، ئـيتر مـن هەرگيز ئەم سەرزەمين و وڵاتە بەجێناهێڵم هەتـا بـاوكم مۆڵـەتم دەدات، ياخود خـوا فـەرمانێـك بـدات لـە قـازانجم بێـت، ئـەو زاتـەش چـاكترينی دادوەرانـە. بگــەڕێنــەوە بــۆ لای باوكتــان و پێــی بڵــێن: ئــەی بــاوكی بەڕێزمان، بێگومان كوڕەكەت دزيی كـرد و ئێمـە ئاگامـان لـیٚ نـەبـووە، جگە لەوەی كە زانيومانە، ئێمە لە شـاراوە و نهێنييـەكـان شـارەزا نـين (نازانين ئـەو كـوڕە بـۆ وای كـرد). (حـەز دەكـەيـت، لـە خـەڵكـی) ئـەو شارەش بپرسە كە ئێمەی لیٚ بووين، لەو كاروانـەش بپرسـە كـە ئێمـەی تێدا بووين و پێكـەوە هاتينـەوە، ئێمـە بـەدڵنياييـەوە ڕاسـت دەڵـێين و ڕاستگۆشين. (يەعقوب) وتی: بەڵكو ديسانەوە خۆتـان پيلانێكـی ترتـان ڕێكخسـتووە، جـا چـارم نييـە خۆگرييـەكـی جـوان نـەبێـت، ئومێـدە پەروەردگار هەموويانم بۆ بهێنێتەوە و بە هەموويان شاد ببم، بە ڕاستی ئەو زاتە زانا و دانايە).

دیقەت بدەن: ئێوە بڕۆنەوە بۆ لای باوکتان و **پێی بڵێن:** ئەی باوکی بەڕێزمان، بێگومان کوڕەکەت دزیی کردووە و ئێمە ئاگامان لێی نەبووە.... **یەعقوب وتی:** بەڵکو خۆتان پیلانی ترتان ڕێکخستووە.....
لێرەدا سێ دیمەن هەیە، دیمەنی یەکەم لە میسردایە و برا گەورەکە بە براکانی دیکەی دەڵێت بچن بە باوکمان ئاوا بڵێن، دیمەنی سێهەم لە کەنعانە و وەڵامی یەعقوبی باوکیانە. لە نێوان ئەم دوو دیمەنەشدا دیمەنی دووەم هەیە: ڕۆیشتنەوەی براکان و بڕینی ڕێگای دوور و درێژی نێوان میسر و کەنعان و گەیاندنی پەیامەکە بە باوکیان، بەڵام دیمەنەکە بەسەر هەموو ئەمانەدا باز دەدات بەسەر "زەمان و مەکان"دا و، یەکسەر وەڵامی باوکەکە دەگوازێتەوە، بەمەش قسەکەی براکەیان دەبێتە کۆتایی دیمەنی یەکەم و سەرەتای دیمەنی سێهەم و بەڵگەی ئەوەشە کە براکان دەقاودەق قسەکانی برا گەورەکەیان گەیاندووە بە باوکیان بەبێ زیاد و کەم.

## پێچەوانەی بازدان:

ئەنجا با دیقەتی دیمەنێکی دیکەی سوورەتەکە بدەین، کە پێچەوانەی ئەوەیە کە باسمانکرد لە بازدان بەسەر "شوێن ـ مەکان"دا، ئەو کاتەی کە یوسف خۆی لە براکانی ئاشکرا دەکات و پاشان پێیان دەفەرموێت: بڕۆنەوە ئەم کراسەم بدەن بەسەر ڕووخساری باوکمدا و ئەویش چاوەکانی چاک دەبنەوە. بەپێی ئەو بنەمایەی کە لە دوو

نموونەی پێشوودا کارمان لەسەر کرد، پێویستوایە کە دەقەکە بەمجۆرە بێت: "بڕۆنەوە کراسەکەم بدەن بەسەر ڕوخساری باوکمدا و ئەویش چاوەکانی چاك دەبنەوە، کاتێك کراسەکەیان دا بەسەر روخساریدا، چاوی یەعقوب چاك بوویەوە..."، واتە پێویستوایە باز بدرێت بەسەر "شوێن ـ مەکان"دا، بەڵام نا.... لێرەدا زۆر پێویستە ئەو نێوانە ـ لە گەڕانەوەی براکان بۆ لای باوکیان بە کراسەکەوە و وتووێژی نێوان باوك و خێزانەکە لە کەنعان و بۆنکردنی کراسەکە لە لایەن یەعقوبەوە ـ هەمووی باس بکرێت و باز نەدرێت بەسەریدا، لەبەر گرنگیی باسەکە.. جا با دیقەتی ئایەتەکان بدەین: ﴿ ٱذۡهَبُواْ بِقَمِيصِي هَٰذَا فَأَلۡقُوهُ عَلَىٰ وَجۡهِ أَبِي يَأۡتِ بَصِيرٗا وَأۡتُونِي بِأَهۡلِكُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴿٩٣﴾ وَلَمَّا فَصَلَتِ ٱلۡعِيرُ قَالَ أَبُوهُمۡ إِنِّي لَأَجِدُ رِيحَ يُوسُفَۖ لَوۡلَآ أَن تُفَنِّدُونِ ﴿٩٤﴾ قَالُواْ تَٱللَّهِ إِنَّكَ لَفِي ضَلَٰلِكَ ٱلۡقَدِيمِ ﴿٩٥﴾ فَلَمَّآ أَن جَآءَ ٱلۡبَشِيرُ أَلۡقَىٰهُ عَلَىٰ وَجۡهِهِۦ فَٱرۡتَدَّ بَصِيرٗاۖ قَالَ أَلَمۡ أَقُل لَّكُمۡ إِنِّيٓ أَعۡلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٩٦﴾ ﴾ (یوسف: ٩٣ـ ٩٦) واتە: (بڕۆن ئەم کراسەم بەرن و بیدەن بەسەر ڕووی باوکمدا، بینایی بۆ دەگەڕێتەوە و چاوی چاك دەبێتەوە، پاشان هەموو کەسوکارتانم بۆ بهێنن بە گشتی. کاتێك کاروان ئاوەدانی بەجێهێشت و کەوتە ڕێ، باوکیان وتی: بە ڕاستی من هەست بە بۆنی یوسف دەکەم، ئەگەر بە بێهۆش و خەڵەفاوم نەزانن. ئەو کەسانەی کە لە لای بوون وتیان: سوێند بە خوا، بێگومان تۆ هەر لە ناو سەرگەردانی و خەیاڵە کۆنەکەی خۆتدایت! پاشان کە مژدەهێنەرەکە گەیشت و کراسەکەی دا بەسەر دەموچاویدا، خێرا

بینایی بۆ گەڕایەوە، چاوەکانی گەشایەوە، وتی: ئایا من پێمنەوتن، بە ڕاستی ئەوەی من دەیزانم لە لایەن خواوە، ئێوە نایزانن؟!).

دیمەنی یەکەم لە میسرە، کە یوسف قسە لەگەڵ براکانی دەکات بۆ ناردنەوەی کراسەکەی. دیمەنی سێهەم لە کەنعانە، کە یەعقوب لە ناو خانەوادەکەیدا دانیشتووە و کوڕەکانی دەگەڕێنەوە بۆ لای.. جا ئەگەر مەبەست لە کورتبڕیی لە چیرۆکە قورئانییەکاندا کەمکردنەوەی وشە و پیتەکان بوایە، دەبوایە ـ وەك وتمان ـ بە یەك دێڕ کۆتایی بە باسەکە بهاتایە، بەڵام ئامانجی چیرۆکەکان ئەوە نییە، بەڵکو خزمەتکردنە بەو مەبەستە سەرەکییانەی کە قورئانی لە پێناودا دابەزیوە... یەکێك لەوانە ـ لەم باسەدا ـ ئەوەیە کە ئێمە وادەزانین یەعقوب تووشی بەلا و تاقیکردنەوەی هاوشێوەی پێغەمبەرانی دیکە نەبووەتەوە و تەنها تاقیکردنەوەی ئەو، ونبوونی کوڕەکەی بووە، بەڵام لەو وردەکارییەی کە باس لە نێوان قسەکەی یوسف و چاکبوونەوەی چاوی یەعقوب دەکات، واتە دیمەنی دووەم، ئاماژەیەکی تێدایە کە یەعقوب پێغەمبەر (سەلامی خوای لێبێت) وەك پێغەمبەرانی دیکە موبتەلا بووە بە میللەتەکەیەوە، ئەوەتە پێی دەڵێن: (قَالُوا۟ تَٱللَّهِ إِنَّكَ لَفِى ضَلَـٰلِكَ ٱلْقَدِيمِ) بەڕاستی تۆ هێشتا هەر لە گومڕاییەکەی پێشووی خۆتدایت..

**نموونـەی چـوارەم:** چـیرۆکی سـولەیمان و شـاژنی سـەبەء لـە سـێ دیمەندا، دیمەنی یەکەم لە ناو کۆشکی سولەیماندا و ناردنی نامەیەك لـە شامەوە بۆ یەمەن بە باڵندەی "هودهود"دا، دیمەنی سێهەم: لە یەمـەن و لـە نـاو کۆشـکەکەی شـاژندا... لـە نێوانیشـیاندا دیمـەنی دووەم کـە باسنەکراوە.. دیقـەتی ئایەتـەکان بـدەن: ﴿قَالَ سَنَنظُرُ أَصَدَقْتَ أَمْ كُنتَ مِنَ الْكَاذِبِينَ ﴿٢٧﴾ اذْهَب بِّكِتَابِي هَٰذَا فَأَلْقِهْ إِلَيْهِمْ ثُمَّ تَوَلَّ عَنْهُمْ فَانظُرْ مَاذَا يَرْجِعُونَ ﴿٢٨﴾ قَالَتْ يَا أَيُّهَا الْمَلَأُ إِنِّي أُلْقِيَ إِلَيَّ كِتَابٌ كَرِيمٌ ﴿٢٩﴾ إِنَّهُ مِن سُلَيْمَانَ وَإِنَّهُ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ﴿٣٠﴾﴾ (النمل: ٢٧ـ ٣٠) واتە: (سولەیمان وتی بە پەپوو: ئێمە لە مەودوا لەو گوفتارەی تۆ دەکۆڵینەوە، تا بزانین راست دەکەیت یان لە ڕیزی درۆزنانیت. برۆ ئەم نامەیە ببەو بۆیان فڕێ بدە، پاشان خۆت حەشـار بـدە و بزانـە دەڵـێن چـی و چ باسوخواسـێك دەکەن. (شاژن) وتی: ئەی ڕێزداران، بە ڕاستی من نامەیـەکی پـیرۆز و بەڕێزم بۆ دانراوە. نامەکە لە سولەیمانەوە و بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبانەوە (دەستپێدەکات)...

دیمەنی یەکەم: سولەیمان بە هودهود دەفەرموێت: ئـەم نووسـراوەی مـن ببـە و فڕێیبـدە بۆیـان... دیمـەنی سـێهەم: شـاژن بـە پیاومـاقوڵان دەڵـێـت: مـن نووسـراوێکم بـۆ هەڵـدراوە... ئـیتر دیمـەنی دووەم، واتـە دووریی نێوان شام و یەمەن بازی بەسەردا دراوە، کە مرۆڤی ئاسایی لەو سـەردەمەدا بـە چـەند مانگێـك ئـەو ماوەیـەی بڕیـوە.. بـەڵام سـەیری

بەستنەوەی دوو دیمەنەکە بکە لە ڕێی وشەکانیشەوە: (فَأَلْقِهْ إِلَيْهِمْ) (بۆیان فڕێ بدە) (بۆیان هەڵبدە)، شاژنیش دەڵێت (إِنِّيٓ أُلْقِيَ إِلَيَّ) (بۆمهەڵدراوە)...

بەڵام با لە شتێکی دیکە وردبینەوە لەم نموونەی چوارەمە، ئەویش قسەکانی هودهودە کاتێك باسی یەمەن و سەبەء دەکات، سولەیمان لێیدەپرسێت: بۆ دواکەوتوویت و لێرە ئامادە نەبوویت؟ ئەویش - پێویستوایە بڵێت لە فلان شوێن بووم و بەس -، بەڵام سەیر دەکەین هودهود درێژە بە قسەکانی دەدات و دەڵێت ئەوان خۆر دەپەرستن و خوا ناپەرستن: ﴿ وَجَدتُّهَا وَقَوْمَهَا يَسْجُدُونَ لِلشَّمْسِ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَعْمَٰلَهُمْ فَصَدَّهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ فَهُمْ لَا يَهْتَدُونَ ﴿٢٤﴾ أَلَّا يَسْجُدُوا۟ لِلَّهِ ٱلَّذِى يُخْرِجُ ٱلْخَبْءَ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَيَعْلَمُ مَا تُخْفُونَ وَمَا تُعْلِنُونَ ﴿٢٥﴾ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٢٦﴾ ﴾ (النمل: ٢٤_ ٢٦) واتە: (بینیم کە خۆی و قەومەکەی، سوژدەیان بۆ خۆر دەبرد لەجیاتی خوا، شەیتان کار و کردەوەکانیانی شیرین و جوان کردبوو لە بەرچاویان، هەربۆیە بە هۆی ئەوە لە ڕێگا لایانداوە و هیدایەتیان وەرنەگرتووە. (شەیتان ڕێی لێگرتن) بۆ ئەوەی سوژدە نەبەن بۆ ئەو خوایەی کە نهێنی دەردەکێشێت لە ئاسمانەکان و زەویدا و دەزانێت ئێوە چی دەشارنەوە و چیش ئاشکرا دەکەن.. خوا ئەو زاتەیە کە جگە لەو خوایەکی تر نییە، خاوەنی تەختی مەزن و گەورەیە). سەیر بکەن! چی پێویست بەم

باسی عەقیدە و ئەوەی کە خوا دەزانێت چ ئاشکرا بکەن و بیشارنەوە و خوا خاوەنی عەرشی عەزیمە.. ئەم درێژکردنەوەی وەڵامەی هودهود بۆ باسکراوە؟

لەوەڵامدا دەڵێین: هۆکارەکەی دوو شتە:

**یەکەم:** وەڵامەکەی هودهود بۆ خزمەتکردنە بە مەبەستە سەرەکییەکەی هاتنی قورئانی پیرۆز کە بابەتی عەقیدە و یەکخواپەرستییە، کە باسکردنی ئەمە لە هەموو بۆنە و بابەتێکدا لە قورئاندا هاتووە و مەبەستی سەرەکیی دابەزینی ئەم کتێبە پیرۆزەیە..

**دووەم:** باسکردنی مەبەستەکانی قورئان، لە ڕێی زمانەوەیە، واتە زمانی قورئانی پیرۆز، کە یەکێك لە بوارەکانی ئیعجازی قورئانیش بابەتی ڕەوانبێژییە، دوو لە هونەرە ڕەوانبێژییەکانی قورئان بریتین لە: کورتبڕی و درێژکردنەوە، لەم باسەی چیرۆکی سولەیمان و هودهوددا هەردوو هونەرەکە دەبینین: لێرەدا درێژکردنەوەی باسەکە هەیە لەبەر بابەتی عەقیدە، لە ناردنی نامەکەشدا کورتبڕیی هەیە لەبەر پێویستنەبوونی باسکردنی چۆنیەتی فڕینی هودهود و گەیشتنی بە یەمەن..

**نموونەی پێنجەم:** لێرەدا درێژە بە باسەکە نادەین و بە کورتی چەند نموونەیەك کە تیایاندا باز بەسەر ڕووداوەکاندا دراوە لە ڕووی کات و شوێن "زەمان و مەکان"، بەڵام لێکۆڵینەوە و شیکرنەوەی بەجێدەهێڵین بۆ خوێنەر...

لەوانە:

١ـ سولەیمان و گەیشتنی عەرشەکەی شاژن، ئەوکاتەی سولەیمان داوا لە ئامادەبووانی مەجلیسەکەی دەکات: کێ دەتوانێت عەرشەکەی شاژن لە یەمەنەوە بهێنێت بۆ ئێرە: ﴿ قَالَ ٱلَّذِى عِندَهُۥ عِلْمٌ مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ أَنَا۠ ءَاتِيكَ بِهِۦ قَبْلَ أَن يَرْتَدَّ إِلَيْكَ طَرْفُكَ ۚ فَلَمَّا رَءَاهُ مُسْتَقِرًّا عِندَهُۥ ﴾ (النمل: ٤٠) واتە: (ئەو کەسەی کە زانست و زانیاری لە (نهێنییەکانی) کتێبی تەورات هەبوو، وتی: من بۆتی دەهێنم بە چاوتروکاندنێك. ئەوسا کتوپڕ سولەیمان بینی تەختی پاشایەتی لە لایدا دانراوە...)، کە لێرەدا زەمەن نەماوە لە نێوان قسەکەی زاناکە و گەیشتنی عەرشەکە لە یەمەنەوە بۆ شام.

٢ـ فەرمانکردن بە مووسا کە بە گۆچانەکەی لە بەردەکە بدا، ئەو کاتەی قەومی مووسا داوایان لە مووسا کرد ئاویان بۆ پەیدا بکات، ئەویش لە خوا پاڕایەوە و خوای گەورەش پێیفەرموو: ﴿ فَقُلْنَا ٱضْرِب بِّعَصَاكَ ٱلْحَجَرَ ۖ فَٱنفَجَرَتْ ﴾ (البقرة: ٦٠) واتە: (ئێمەش پێمانوت: بە گۆچانەکەت بدە بە (تاشە) بەردەکەدا. بەردەکە دوازدە کانی لێهەڵقوڵا)، ﴿ أَنِ ٱضْرِب بِّعَصَاكَ ٱلْحَجَرَ ۖ فَٱنۢبَجَسَتْ ﴾ (الإعراف: ١٦٠)، واتە: (دارعەساکەت بماڵە بە بەردەکەدا، بەردەکە دوازدە کانی لێهەڵقوڵا)... نەمانی زەمەن لە نێوان لێدانی بەردەکە و تەقینەوەی ئاوەکەدا.

٣ـ ئەمانی زەمەن لە نێوان نزای مووسا و وەڵامدانەوەی پەروەردگار بۆی، کە کۆچ بکەن لە میسر، کاتێك مووسا و قەومەکەی لە لایەن فیرعەونەوە زۆریان بۆ هات، لە خوا پاڕایەوە کە فریایان بکەوێت: ﴿ فَدَعَا رَبَّهُۥٓ أَنَّ هَٰٓؤُلَآءِ قَوْمٌ مُّجْرِمُونَ ﴿٢٢﴾ فَأَسْرِ بِعِبَادِى لَيْلًا إِنَّكُم مُّتَّبَعُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾ (الدخان: ٢٢ـ ٢٣)، واتە: (هانا و هاواری بردووە بۆ پەروەردگاری: پەروەردگارا، بە ڕاستی ئەمانە کۆمەڵێکی تاوانبارن. شەوڕەویی بکە بە بەندەکانم و شار چۆڵ بکەن، بێگومان ئەوانە بە دواتاندا دێن). دیقەت بدەن، یەکسەر پاش نزاکەی مووسا، دەستبەجێ خوا پێی دەفەرموێت: شەوڕەویی بە بەندەکانم بکە...

٤ـ فەرموودەی پەروەردگار لە بارەی دروستکردنی ئادەم و دەستبەجێ سوژدەبردنی فریشتەکان بۆی: ﴿ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِى فَقَعُوا۟ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ﴿٢٩﴾ فَسَجَدَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ كُلُّهُمْ أَجْمَعُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾ (الحجر: ٢٩ـ ٣٠)، واتە: (جا کاتێك ڕێکوپێك و تەواوم کرد، لەو ڕۆحە تایبەتییەی کە من (بەدیهێنەری ئەوم)، پێمبەخشی، ئەوە هەمووتان کڕنووشی بۆ بەرن، پاشان فریشتەکان هەموویان بە گشتی کڕنووشی ڕێزیان برد)...

٥ـ فەرمانی نەمرود بە سووتاندنی ئیبراهیم و دەستبەجێ فەرمانکردنی پەروەردگار بە ساردبوونەوەی ئاگرەکە: ﴿ قَالُوا۟ حَرِّقُوهُ وَٱنصُرُوٓا۟ ءَالِهَتَكُمْ إِن كُنتُمْ فَٰعِلِينَ ﴿٦٨﴾ قُلْنَا يَٰنَارُ كُونِى بَرْدًا وَسَلَٰمًا عَلَىٰٓ

إِبْرَٰهِيمَ ﴿٦٩﴾﴾ (الانبياء: ٦٨- ٦٩)، واته: (هەندێکیان وتیان: ئیبراهیم بسووتێنن و پشتیوانی لە خواکانتان بکەن، ئەگەر ئێوە شتێکتان بۆ دەکرێت. وتمان: ئەی ئاگر سارد و سەلامەت بە لەسەر ئیبراهیم)...

## دووەم: بازدان بە تێپەڕاندنی "کات و زەمان":

لە یەکێك لە دیمەنەکانی دیکەی چیرۆکە قورئانییەکاندا، جۆرێکی دیکە دەبینین، ئەویش بازدانە بە رووداو بەسەر کات و زەمەندا. با نموونەکان وەربگرین:

**نموونەی یەکەم:** چیرۆکی خاتوو مەریەمی پاکیزە و سەروەرمان عیسا (سەلامی خوای لێبێت). دیقەت بفەرموون: ﴿إِذْ قَالَتِ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَٰمَرْيَمُ إِنَّ ٱللَّهَ يُبَشِّرُكِ بِكَلِمَةٍ مِّنْهُ ٱسْمُهُ ٱلْمَسِيحُ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ وَجِيهًا فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ وَمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴿٤٥﴾ وَيُكَلِّمُ ٱلنَّاسَ فِى ٱلْمَهْدِ وَكَهْلًا وَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٤٦﴾ قَالَتْ رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِى وَلَدٌ وَلَمْ يَمْسَسْنِى بَشَرٌ قَالَ كَذَٰلِكِ ٱللَّهُ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ إِذَا قَضَىٰٓ أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٤٧﴾ وَيُعَلِّمُهُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ ﴿٤٨﴾ وَرَسُولًا إِلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ أَنِّى قَدْ جِئْتُكُم بِـَٔايَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ أَنِّىٓ أَخْلُقُ لَكُم مِّنَ ٱلطِّينِ كَهَيْـَٔةِ ٱلطَّيْرِ فَأَنفُخُ فِيهِ فَيَكُونُ طَيْرًۢا بِإِذْنِ ٱللَّهِ وَأُبْرِئُ ٱلْأَكْمَهَ وَٱلْأَبْرَصَ وَأُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ بِإِذْنِ ٱللَّهِ وَأُنَبِّئُكُم بِمَا تَأْكُلُونَ وَمَا تَدَّخِرُونَ فِى بُيُوتِكُمْ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَةً لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٤٩﴾﴾ (آل عمران تا کۆتایی ئایەتی ٥٢). کاتێك فریشەکە بە مەریەمی وت: ئەی مەریەم بە ڕاستی خوا مژدەت دەداتێ:

به وشەیەکی خۆی  کە ناوی (المسیح)ـە، عیسای کوڕی مەریـەمـە، کـە پیاوماقووڵ و پایەبەرزە لەم دنیادا، لە قیامەتیشدا لە دەستەی نزیکانە، جا عیسا لە بێشکەدا و بـە گـەورەیـیش قسـە دەکـات بـۆ خـەڵکـی، لـە پیاوچاکانیشە. ئەوسا مەریەم وتی: پەروەردگارا، جا چـۆن مـن منـداڵم دەبێت: خۆ کەس توخنم نەکەوتووە، (جوبرەئیل) فەرمـووی: ویسـت و فەرمانی خوا هەروایە و چی بوێت دروستی دەکات، هەر کاتێـك شـتێکی بوێت تەنها پێی بڵێ ببە، دەستبەجێ دەبێت. هـەروەهـا خـوای گـەورە فێری کتێب و نووسین و دانایی و تەورات و ئینجیلی دەکات. دەیکات بە پێغەمبەر بۆ لای نەوەی ئیسرائیل کە: بۆ لای ئێوە ڕەوانە کراوم، بەڵگە و نیشانەیەکیشم پێیە لە لایەن پەروەردگارتانەوە، (ئەویش ئەمەیە کە): من لە قوڕ شێوەی باڵنـدەتـان بـۆ دروسـت دەکـەم، ئینجـا فـووی پێـدا دەکەم، بە فەرمانی خوا یەکسەر، دەبێتە باڵندەیەکی زینـدوو و کـوێری زکمـاك و نـەخۆشـی بـەڵـەکیـی، چـاك دەکـەمـەوە بـە ویسـتی خـوا و مردووانیش زیندوو دەکەمەوە بە فەرمانی خوا و هەواڵی ئەو شتانەی کە دەیخۆن و هەڵی دەگرن لەماڵەکانتاندا پێتانڕادەگەیەنم، بـەڕاسـتی لـەو شتانەدا بەڵگە و نیشانە هەیە بۆتان ئەگەر ئیماندارن).

سەرەتای دیمەنەکە قسە و باسی فریشتەیە لەگەڵ خـاتوو مەریـەمی پاکیزە، کە خوا کـوڕێکی پێدەبەخشـێت و وەڵامـی مەریەمـە کـە چۆن بەبێ هاوسـەر منـداڵی دەبێـت و پاشـان قسـەی فریشـتەکان لـە بـارەی کوڕەکەیەوە کـە چـۆن قسـە لەگـەڵ بـەنی ئیسـرائیل دەکـات و چـییان

پێدەڵێت و پاشان کتوپڕ باز بەسەر کات و زەمەندا دەدرێت کە زیاتر لە (٣٠ ساڵ) دەبێت لەو کاتەوەی کە فریشتەکان قسە لەگەڵ مەریەم دەکەن تا ئەوکاتەی عیسا (سەلامی خوای لێبێت) گەورە بووە و بووە بە پێغەمبەر و لەگەڵ بەنی ئیسرائیلدا وتوویژ دەکات... کتوپڕ خوێنەر دەخاتە ناوجەرگەی ململانێی عیسای سەروەرمان و بەنی ئیسرائیل...

**نموونەی دووەم:**

ئەم نموونەیان تایبەتە بە ژیانی سەروەرمان زەکەریا و یەحیا (سەلامی خوایان لێبێت). زەکەریا پیر بووە و هێشتا منداڵیان نەبووە، داوا لە خوا دەکات منداڵێکیان پێببەخشێت. دیقەتی دیمەنەکان بدەن لە ئایەتەکاندا: ﴿ قَالَ رَبِّ ٱجْعَل لِّيٓ ءَايَةً قَالَ ءَايَتُكَ أَلَّا تُكَلِّمَ ٱلنَّاسَ ثَلَٰثَ لَيَالٍ سَوِيًّا ﴿١٠﴾ فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوْمِهِۦ مِنَ ٱلْمِحْرَابِ فَأَوْحَىٰٓ إِلَيْهِمْ أَن سَبِّحُوا۟ بُكْرَةً وَعَشِيًّا ﴿١١﴾ يَٰيَحْيَىٰ خُذِ ٱلْكِتَٰبَ بِقُوَّةٍ وَءَاتَيْنَٰهُ ٱلْحُكْمَ صَبِيًّا ﴿١٢﴾ وَحَنَانًا مِّن لَّدُنَّا وَزَكَوٰةً وَكَانَ تَقِيًّا ﴿١٣﴾ وَبَرًّۢا بِوَٰلِدَيْهِ وَلَمْ يَكُن جَبَّارًا عَصِيًّا ﴿١٤﴾ وَسَلَٰمٌ عَلَيْهِ يَوْمَ وُلِدَ وَيَوْمَ يَمُوتُ وَيَوْمَ يُبْعَثُ حَيًّا ﴿١٥﴾ ﴾ (مەریەم: ١٠ ـ ١٥)، واتە: (زەکەریا وتی: پەروەردگارا، نیشانەیەکم پێببەخشە تا دڵنیابم، کە ئەو مژدەیە هاتۆتە دی، خوای گەورە فەرمووی: نیشانە و بەڵگەت ئەوەیە (لەسەر بوونی ئەو کوڕە) کە تۆ ناتوانیت سێ شەوی تەواو (بە ڕۆژەکانیەوە) قسە لەگەڵ خەڵکیدا بکەیت. لە پەرستگاکەی هاتە دەرەوە بۆ ناو قەومەکەی و ئاماژەی بۆ کردن بەیانیان و ئێواران تەسبیحات و ستایش بکەن. ئەی یەحیا کتێبی (تەورات) بە توندی بگرە و پابەندی بە و هەر لە تەمەنی

نەوجەوانیدا، توانای جیاکردنەوەی ڕاست و ناڕاستمان پێبەخشی، بە دادوەرێکی ڕێکوپێك کێشەی خەڵکەکەی چارەسەر دەکرد. یەحیا دڵ و دەروونێکی پڕ لە سۆزو خۆشەویستی و پاکوخاوێنی هەبوو کە لە لایەن خۆمانەوە پێمانبەخشیبوو و ئەو زۆر خواناس و پارێزکار بوو. هەروەها چاکڕەفتار و جوانڕەفتار بوو لەگەڵ باوك و دایکیدا، وەنەبێت ئەو کەسێکی دڵڕەق و یاخی و نالەبار بوو بێت. درووود و سەلامی خوای لێبێت لەو ڕۆژەدا کە لەدایك بوو و لەو ڕۆژەدا کە وەفات دەکات، لەو ڕۆژەشدا کە هەڵدەستێت و زیندوو دەبێتەوە).

دیقەت بفەرموون: زەکەریا لە میحراب دانیشتووە و لە خوا دەپاڕێتەوە کە منداڵێکی پێببەخشێت، پەروەردگار وەڵامی دەداتەوە و نیشانەی ئەو وەڵامدانەوەش لەزمانکەوتنی زەکەریایە بۆ ماوەی سێ شەو، کە زەکەریا لە میحرابەکە دێتە دەر (فخرج على قومه من المحراب) دەستبەجێ لەزماندەکەوێت و بە ئاماژە بە قەومەکەی دەڵێت سوپاس و ستایشی خوا بکەن بەیانیان و ئێواران.. لێرەدا پێویستوایە درێژە بە ژیانی زەکەریا و منداڵبوونیان و لەدایکبوونی یەحیا و گەورەبوونی و بەپێغەمبەربوونی بکرێت جا بفەرموێت "ئەی یەحیا! ئەو کتێبە بگرە بە هێز و تواناوە"... بەڵام ئەوەی کە پێویست نەبێت ئەو زەمەنەی نێوان هاتنە دەرەوەی زەکەریایە لە میحراب تا گەورەبوونی یەحیا، کە چەندین ساڵ نێوانیانە. بەڵام بازدانەکە لێرەدایە، کە دەستبەجێ یەحیا بووە بە پێغەمبەر و خوا بانگی دەکات بۆ وەرگرتنی پەیامەکەی،

بەوەش خوێنەر کە خەریکی خوێندنەوەی باسی زەکەریایە، کتوپڕ خۆی دەبینێتەوە لە بەردەم یەحیایەکی گەورە و پێگەیشتوو، کە بانگدەکرێت بۆ وەرگرتنی پەیام.

جا ـ وەك دەڵێن قسە قسە دەهێنێت ـ بەڕاستی ئەم چەند ئایەتە کەمە، هێندە پڕ واتا و ئاماژەی جۆربەجۆرن، کە مرۆڤ دەستەوسان دەکات لە بەردەم قورئاندا و ناچارمان دەکات ئاماژە بە چەند خاڵێکی بدەین، لەوانە:

١ـ نزاکردنی زەکەریا لە میحرابەکە و وەڵامدانەوەی خوایی بۆ نزاکەی و دانانی نیشانە بۆی، کە "لەزمانکەوتنیەتی"، دەستبەجێ، بەڵێ زۆر بە خێرایی، ڕوودەدات، ئەوەتا زەکەریا هەر لە میحرابەکە دێتە دەر، یەکسەر لەزمان دەکەوێت، وەك بڵێی لە ئان و ساتدا خوا نزاکەی لێوەرگرت و بەبێ تێپەڕبوونی ماوەیەکی زۆر بەسەریدا. خوێنەر هێشتا کاریگەریی ئەو وتووێژەی لەسەرە کە تازە بە تازە لە میحرابەکەدا کۆتایی هاتووە، وە زەکەریا دێتە دەرەوە، دەبینێت قەومەکەی هاتوون بۆ ئەوەی نوێژیان بۆ بکات، ئەویش بە ئاماژە پێیان دەڵێت و بە ئاماژە قسەیان لەگەڵدا دەکات، دیسانەوە کتوپڕ "بانگەوازێك" دەبیستین کە نازانین سەرچاوەکەی کوێیە و بانگی "یەحیا" دەکات و پێی دەفەرموێت: ﴿ يَٰيَحۡيَىٰ خُذِ ٱلۡكِتَٰبَ بِقُوَّةٖۖ وَءَاتَيۡنَٰهُ ٱلۡحُكۡمَ صَبِيّٗا ﴾، (ئەی یەحیا! ئەو کتێبە بە هێز و تواناوە بگرە...)، تا بۆمان دەربکەوێت کە ئەمە، ئەو یەحیایەیە کە کەمێك پێش ئێستا مژدەی

هاتنه دونیای درا به زەکەریا، جا یەکەمجار خوێنەر وادەزانێت ئەم بانگکردنەش تەواوکەری وتووێژەکەی پێشتری پەروەردگارە لەگەڵ زەکەریا، بەڵام دەردەکەوێت کە ئەو وتووێژە کۆتایی پێهاتووە و ئەمە دیمەنێکی تازەیە کە چەندین ساڵ بە سەریدا تێپەڕیوە..

٢ـ ئەگەر بەراوردێك بکەین لە نێوان چیرۆکی یوسف و مووسا و یەحیادا (سەلامی خوایان لێبێت) لە بابەتی "گەورەبوون و پێگەیشتن و بوون بە پێغەمبەرییەوە"، دەبینین لە چیرۆکی یوسفدا خوای گەورە ئاماژە بە پێگەیشتنی یوسف دەکات کە دەفەرموێت: ﴿ وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥٓ ءَاتَيْنَـٰهُ حُكْمًا وَعِلْمًا ﴾ (یوسف: ٢٢)، واتە: (کاتێك یوسف پێگەیشت و بەتوانا بوو، حوکم و زانستمان پێبەخشی). لە چیرۆکی مووساشدا دەفەرموێت: ﴿ وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ وَٱسْتَوَىٰٓ ءَاتَيْنَـٰهُ حُكْمًا وَعِلْمًا ﴾ (القصص: ١٤)، بەهەمانشێوە، بەڵام بۆ لە باسی یەحیادا ئەمە بوونی نییە و یەکسەر بازدانەکە بۆ سەردەمی پێغەمبەرایەتییەکەیەتی؟ لە وەڵامدا دەڵێین **لەبەر پێویستیی باسەکەیە**، لە باسی یوسفدا پێویست بەوە دەکات ئاماژە بەوە بکرێت کە گەورەبووە و پێگەیشتووە و گەیشتووەتە پلەی "پیاوی کامڵ"، لەبەر ئەوەی لە دوای ئەوە باسی ئەوەیە کە ژنەکەی عەزیزی میسر حەزی لێدەکات، دەی ئەگەر گەورە نەبووبێت و پێنەگەیشتبێت و نەبووبێتە پیاوێکی کامڵ، ژنەکەی عەزیز

حەز لە منداڵێكی بچووك ناكات وەك ئەوكاتەی كە كڕییان و كردیانە خزمەتكارێكی ماڵەكەیان...

لە باسی مووساشدا (سەلامی خوای لێبێت)، پێویستە باس لەوە بكرێت كە مووسا پێگەیشتووە و بووەتە پیاوێكی كامڵ، لەبەر ئەوەی لە دواتردا باسی ئەوە دەكرێت كە پیاوێك بە "مشتەكۆڵە" و پیاكێشانێك دەكوژێت، دەی ئەگەر نەبووبێتە پیاوێكی تەواوەتیی، ناتوانێت مرۆڤێكی دیكە بكوژێت بە یەك پێداكێشان...

بەڵام، یەحیا وانییە، وەك بڵێی ئاماژەیەكە بۆ ئەوەی كە خوای گەورە دەستبەجێ نزاكەی زەكەریای باوكی گیرا كردووە و چاوی پێغەمبەرەكەی ڕۆشنكردووەتەوە بە بەخشینی نەوەیەك پێی، وە بە خێراییش گەیاندوویەتییە پلەی پێغەمبەرایەتی...

خوایە! چاوی ئەو كەسانە ڕۆشن بكەرەوە كە وەك زەكەریا هێشتا چاوەڕێی بەخشینی مژدەیەكی خۆشن لە ئاسمانەوە...

# بەشی سێهەم

# جۆرەکانی بازدان بە رووداو

لەم بەشەدا، باسی چەند هۆکار و ئامانجێك دەکەین کە بە هۆیانـەوە و لەبەر ئەو ئامانجانە، باز بە رووداو دەدرێت، یان دیمـەنی چـیرۆکەکان دەگوازرێنەوە و دیمەنی ناوەڕاست باسناکرێت، لەوانە:

١ـ گواسـتنەوەی رووداو و بـازدان پێـی، لـە جیهـانی بینـراو "عالـەمی شەهادە" بۆ جیهانی نادیار "عالەمی غەیب"، وە لە بەڵا و ناڕەحەتییـەوە بۆ پاداشت.. بۆ نموونە: چیرۆکی حەبیبی دارتاش لە سوورەتی (یس). لـە سـەردەمی عیسـادا (سـەلامی خـوای لێبێـت) سـێ نێـردراو دەنێـردرێن بـۆ شارۆچـکەیەك بـۆ بانگکردنیـان بـۆ لای خواناسـی، لـەوێ کـەس باوەڕیـان پێناکات، تەنها کەسـێکی دارتـاش نـەبێت، کـە بـەپێی گێڕانـەوەکان نـاوی حەبیبە. ئەو بە ئاشکرا بە قەومەکەی دەڵێت من باوەڕم بـە خـوا هێنـاوە، ئـەوانیش بـەردبارانی دەکـەن و شـەهیدی دەکـەن. دواتـر خـوای گـەورە دیمەنی ژیانی دواڕۆژی ئەو پیاوەمـان نیشـان دەدات کـە چـۆن پێشـوازیی لێـدەکرێت بـۆ بەهەشـت. دیقـەت بفـەرموون: ﴿ إِنِّيٓ ءَامَنتُ بِرَبِّكُمۡ فَٱسۡمَعُونِ ٢٥ قِيلَ ٱدۡخُلِ ٱلۡجَنَّةَۖ قَالَ يَٰلَيۡتَ قَوۡمِي يَعۡلَمُونَ ٢٦ ﴾ (یـس: ٢٥ـ ٢٦) واتە: (بەڕاستی من بڕیارمداوە کە ئیمان بە پەروەردگارتان بهێنم، با چاك گوێتان لێبێت. پێیوترا: فەرموو بۆ ناو بەهەشت، لەوێشەوە هەر

دڵسۆزانە وتوویەتی: خۆزگە قەومەکەم بیانزانیایە سەرئەنجامی ئیمان چۆنە و کەوتوومەتە چ ناز و نیعمەتێکەوە)، سەرەتای ئایەتەکە قسەیەکە کە حەبیب لە دونیادا و لە ناو قەومەکەیدایە و دەڵێت کە ئەو باوەڕی بە پەروەردگار هێناوە، قەومەکەیشی بەردبارانی دەکەن، بە دوایدا وتووێژێك دێت کە لە جیهانی غەیبدا روودەدات، لە نێوان ئەو دوو دیمەنەدا هیچ وشەیەك نییە کە باس لە گواستنەوەی رووداوەکە بکات لەم جیهانەوە بۆ ئەو جیهان. حەبیب رووی قسەی لە نێردراوەکانی عیسایە و دەڵێت: من باوەڕم بە پەروەردگاری ئێوە هێناوە، خوێنەر لێرەدا چاوەڕێی وەڵام دەکات لەو نێردراوانە، بەڵام کتوپڕ وەڵام لە جیهانێکی دیکەی نادیارەوە دێت کە مژدە دەدات بەو پیاوە کە دەچێتە بەهەشتەوە و نازانین قسەکەرەکەش کێیە.. هەروەها لە دوودڵیدان ئایا بە ڕاست کابرا چووبێتە بەهەشتەوە، بەڵام وەڵامی پیاوەکە خۆی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەو بەڕاستی چووەتە بەهەشتەوە و ئەو نازونیعمەتەی بینیوە کە وادەی دراوە بە ئیمانداران، لەبەرئەوە وەڵامەکەی ئەوەیە: خۆزگە قەومەکەم بیانزانییایە!! ئا لێرەوە دەردەکەوێت کە پیاوەکە پاش کوژرانی و خستنیە گۆڕەوە و لێخۆشبوونی پەروەردگاری جا چووەتە بەهەشت، بەڵام ئەمانە هیچی باس نەکراون و ڕاستەوخۆ دیمەنەکە گواستراوەتەوە بۆ جیهانی غەیب، لەبەر یەك شت: تا دەرکەوێت کە ڕەحمەت و سۆزی پەروەردگار نزیکە لە چاکەکارانەوە و دەستبەجێ و خێرا ئامادەگی هەیە و ئەم پیاوەش

پاداشـتی خـۆی وەرگرتـووە و بـا مرۆڤـەکانی دیکـەش نەترسـن لـە ڕاگەیاندنی باوەڕی خۆیاندا...

٢ـ جـۆرێکی دیکـەی بـازدان بـە ڕووداو لـە بـواری نـزا و پاڕانـەوەدا ڕوودەدات، وەك ئاماژەدان بە خێرایی وەڵامدانەوەی نزای بەندەکان:

کاتێك مووسا (سـەلامی خـوای لێبێـت) دەپاڕێتـەوە و دەفـەرموێت:

﴿ فَدَعَا رَبَّهُۥٓ أَنَّ هَٰٓؤُلَآءِ قَوْمٌ مُّجْرِمُونَ ﴿٢٢﴾ فَأَسْرِ بِعِبَادِى لَيْلًا إِنَّكُم مُّتَّبَعُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾

(الدخان: ٢٢ـ ٢٣) واتە: (کاتێك مووسا نزا دەکات هەرئەوەندە دەڵێـت: خوایە! ئەمانە هۆزێکی تاوانکارن، واتە بەشێکی نزاکە هاتووە و نزاکەی تـەواو نـەکردووە، لەبـەر ئـەوەی دیـارە ناکرێـت ئـەم ڕسـتە هەواڵییـە "جوملـە خەبەرییـە" بـەس بێـت بـۆ داواکردنـی شـتێك، واتـە ڕسـتەکە وایلێدێت: خوایە! ئەمانە هۆزێکی تاوانکـارن..... ئـەمجا چـی؟، نزاکـە چـییە؟ دەبێـت نزایـەك هـەبێت کـە لەسـەر بنـەمای ئـەم سـکاڵایە داڕێژرابێت، بەڵام لە سیاقی چیرۆکەکەدا نزاکـەی مووسـا بـوونی نییـە، ئەمەش بۆ ئەوەی بەڵگە بێت لەسەر زانست و ئاگاداریی پەروەردگار بەو نزایـە و خێـرا وەڵامدانەوەیشـی. وەك بڵێـی خـوای گـەورە قسـەکەی پێبڕیوە، وەك چۆن ئێمە جاری وا هەیە لە کـاتی قسـەکردنی کەسـێکدا قسـەکەی پێـدەبڕین و یەکسـەر مـژدە خۆشـەکە ڕادەگەیـەنین، پەروەردگاریش ـ ولله المثل الأعلی ـ قسەکەی مووسا دەبڕێت و یەکسەر مـژدەی پێـدەدات بـە مۆڵەتـدان بـە دەرچـوونی خـۆی و لەناوچـوونی فیرعەون...

٣ـ جۆرێکی دیکەی بازدان بە رووداو، لەڕێی هاتنە ناوەوەی کەسێکی دیکە بۆ ناو چیرۆکەکە دەبێت... با سەیری ئەم نموونەیە بکەین:

لە بەسەرهاتی یوسفدا، کاتێك براکانی کۆدەبنەوە کە پیلان بۆ لەناوبردنی یوسف بکێشن، وە لە ئەنجامدا ڕێکدەکەون لەسەر کوشتنی و دواتر دەیگۆڕن بۆ خستنە بیرەوە، ئەم دیمەنە تەواو دەبێت، یەکسەر قسەی براکان بە دوایدا دێت لەگەڵ باوکیاندا: ﴿ إِذْ قَالُوا۟ لَيُوسُفُ وَأَخُوهُ أَحَبُّ إِلَىٰٓ أَبِينَا مِنَّا وَنَحْنُ عُصْبَةٌ إِنَّ أَبَانَا لَفِى ضَلَـٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٨﴾ ٱقْتُلُوا۟ يُوسُفَ أَوِ ٱطْرَحُوهُ أَرْضًا يَخْلُ لَكُمْ وَجْهُ أَبِيكُمْ وَتَكُونُوا۟ مِنۢ بَعْدِهِۦ قَوْمًا صَـٰلِحِينَ ﴿٩﴾ قَالَ قَآئِلٌ مِّنْهُمْ لَا تَقْتُلُوا۟ يُوسُفَ وَأَلْقُوهُ فِى غَيَـٰبَتِ ٱلْجُبِّ يَلْتَقِطْهُ بَعْضُ ٱلسَّيَّارَةِ إِن كُنتُمْ فَـٰعِلِينَ ﴿١٠﴾ قَالُوا۟ يَـٰٓأَبَانَا مَا لَكَ لَا تَأْمَ۫نَّا عَلَىٰ يُوسُفَ وَإِنَّا لَهُۥ لَنَـٰصِحُونَ ﴿١١﴾ أَرْسِلْهُ مَعَنَا غَدًا يَرْتَعْ وَيَلْعَبْ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَـٰفِظُونَ ﴿١٢﴾ ﴾ (یوسف: ٨ـ ١٢) واتە: (کاتێك براکانی یوسف وتیان: بەڕاستی یوسف و براکەی (بنیامین) لای باوکمان، لە ئێمە نازدار و خۆشەویستترن، لەکاتێکدا ئێمە کۆمەڵێکی بەهێزین، بە ڕاستی باوکمان لە سەرلێشێواویەکی ئاشکرادایە. یوسف بکوژن، یان فڕێی بدەنە شوێن و زەویەکی دوور، ئەوکاتە رووی باوکتان یەکلایی دەبێتەوە بۆ ئێوە و خۆشەویستیەکەی هەمووی بۆ ئێوە دەبێت، ئینجا دوای نەمانی یوسف دەبنە پیاو و نەوەیەکی چاك و ڕێکوپێك. یەکێك لە براکانی وتی: یوسف مەکوژن، بەڵکو بیخەنە ناو بیرێکی قووڵەوە، دوایی

کاروان دێت و دەیدۆزنەوە و دەیبەن، ئەگەر بڕیار بێت هەر شتێکی لێبکەن. وتیان: ئەی باوکە ئەوە چیتە لە ئێمە دڵنیانیت لەبارەی یوسفەوە، بەڕاستی ئێمە زۆر دڵسۆزی ئەوین و زۆر خۆشمان دەوێت. بەیانی بینێرە لەگەڵمان با بای باڵی بدات، گەمە و یاری بکات و بێگومان زۆر پارێزگاری لێدەکەین و ئاگامان لێی دەبێت).

ئەمە یان یەك دیمەنە، یان دوو دیمەن، لەبەرئەوەی دەبێت ماوە و نێوانێك هەبێت لە نێوان وتووێژی خۆیان و پیلانگێڕییەکەیاندا لە لایەك و لەگەڵ وتووێژی خۆیان لەگەڵ باوکیاندا، بۆ ئەوەی ڕێگە بدات یوسف بێت لەگەڵیاندا بۆ یاریکردن و گەشت... لەبەرئەوەی ناگونجێت لەبەردەم باوکیاندا دانیشتبن و خەریکی پیلانگێڕیی بووبن.. بەڵام با بپرسین یەعقوب لە کوێ بوو لەو کاتەدا؟.. ئەگەر دیمەنەکە یەك دیمەن بێت، ئەوا ئەوان خەریکی داڕشتنی پیلان بوون و باوکیشیان دێتە ژوورەوە و ئەوانیش ڕاستەوخۆ دەڵێن باوکە بۆ یوسفمان لەگەڵ نانێریت... یاخود ئەوان لە شوێنێکی دوورتر پیلانەکەیان گێڕاوە و پاشان هاتوونەتەوە بۆ لای باوکیان و پێیانوتووە کە یوسفمان لەگەڵ بنێرە... واتە دیمەنەکە لە دوو شوێنی جیاواز ڕوویداوە، بەڵام چۆن ئەم دوو دیمەنە بە یەکەوە بەستراونەتەوە لە گێڕانەوەی چیرۆکەکەدا بە بێئەوەی پچڕان رووبدات تیایدا؟ ئەمە تەنها بە دانانی وشەی "قالوا" هاتووەتە دی، کە لەناوبڕی قسەکانیاندا هاتووە و دەلالەتە لەسەر ئەو

گۆڕانکاریی و بازدان و گواستنەوەیە، بە هاتنەژوورەوەی یەعقوب بۆ ناو باسەکە...

4- جۆرێکی دیکە لەڕێی وتووێژێکی ئاشکرا و کتوپڕ قسەیەکی نهێنی و پاشان گەڕانەوە بۆ ئاشکراکە، ڕوودەدات.. با سەیری ئەم نموونەیە بکەین: جادووبازەکانی میسر کاتێك کۆدەبنەوە بۆ ڕکابەریی مووسا:

﴿ فَتَنَٰزَعُوٓاْ أَمۡرَهُم بَيۡنَهُمۡ وَأَسَرُّواْ ٱلنَّجۡوَىٰ ﴿٦٢﴾ قَالُوٓاْ إِنۡ هَٰذَٰنِ لَسَٰحِرَٰنِ يُرِيدَانِ أَن يُخۡرِجَاكُم مِّنۡ أَرۡضِكُم بِسِحۡرِهِمَا وَيَذۡهَبَا بِطَرِيقَتِكُمُ ٱلۡمُثۡلَىٰ ﴿٦٣﴾ ﴾ (طـه: ٦٢ـــ ٦٣)

واتە: (جادووگەران دوای سرتە و خورتە و تەگبیر و ڕاوێژ، وتیان: شك نییە ئەو دوو نەفەرە جادووگەرن. دەیانەوێت بە جادووی خۆیان ئێوە لەسەرزەمینی خۆتان دەرکەن و ئایین و مەزهەب و ڕێ و ڕەسمی چاکتری ئێوە، پوچەڵ بکەن و لەبەینبەرن).

ئەو جادووبازانە کەوتنە باسوخواس لە ناو خۆیاندا و بە نهێنیی چرپەچرپیان دەستپێکرد، وتیان: بە ڕاستی ئەم دووانە: مووسا و هاروون، دوو جادووبازن....

دیقەت بفەرموون: دیمەن یەك دیمەنە، ڕۆژی کۆبوونەوەی جادووبازەکان و وەستانیان بەرانبەر بە مووسا (سەلامی خوای لێبێت) کە پێیوتن: ئامان بۆتان، درۆ هەڵمەبەستن بەرانبەر بە خوا با سزاتان نەدا، ئەم قسانە کاری تێکردن، ناکۆکیی کەوتە نێوانیان، (وأسرّوا النجوى) بە نهێنی کەوتنە چپەچپ تا مووسا بە ناکۆکییەکەیان نەزانێت، گەورەکانیان توانیان ناکۆکییەکەیان نەهێڵن و یەکیان بخەنەوە بەوەی

ترساندنیان ئەگەر مووسا سەرکەوتوو بێت، ئەوا ئەوان بازاڕیان نامێنێت.. لە ترسی ئەوە یەککەوتنەوە و قسەیان کرد بە یەك و ڕوویانکردەوە مووسا و وتیان: ئەی مووسا! یان تۆ دەستپێبکە، یان با ئێمە سەرەتا دەستپێبکەین، ئەویش فەرمووی: بەڵکو ئێوە دەستپێبکەن... دەبینین سەرەتای دیمەنەکە بە گێڕانەوە (سەرد) وەسفی ناکۆکییەکەمان بۆ دەکات و ڕوونی دەکاتەوە کە وتووێژێکی لاوەکی و نهێنی ڕوویداوە کە مووسا گوێی لێنەبووە، بەڵام ئێمەی خوێنەر و وەرگر گوێمان لێبووە و بۆمان گێڕدراوەتەوە. کاتێکیش چرپەچرپەکە تەواو دەبێت، سیاقەکە باسی ناکات و تەنها وشەی "قالوا" دەهێنێت، کە بەوەدا دەزانین جادووبازەکان ڕوویانکردووەتەوە مووسا و ئەوەی بە نهێنی لەسەری ڕێککەوتبوون، بە مووسایان وت کە دەستبکەن بەڕکابەرییەکە.

هەمان دیمەنی وتووێژی نهێنی لە ناو وتووێژێکی ئاشکرادا، لە چیرۆکی ئیبراهیمیشدا (سەلامی خوای لێبێت) دەبینین، ئەوکاتەی کە لە گەرمەی قسەکردندایە لەگەڵ باوکی و قەومەکەیدا لە بارەی بتەکانەوە، کتوپڕ وتووێژێکی نهێنی دێتە ناو بابەتەکەوە، کە قسەیەکی ئیبراهیمە، کە سوێند دەخوات دەبێت بتەکانتان پارچە پارچە بکەم، پاشان درێژە بە چیرۆکەکە دەدرێت... ئەم چیرۆکە چەند جارێك ئەو بازدانەی تێدا دەبینین، با سەرەتا سەیری ئایەتەکان بکەین: ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَآ إِبْرَٰهِيمَ رُشْدَهُۥ مِن قَبْلُ وَكُنَّا بِهِۦ عَٰلِمِينَ ﴿٥١﴾ إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦ مَا هَٰذِهِ ٱلتَّمَاثِيلُ ٱلَّتِىٓ أَنتُمْ لَهَا عَٰكِفُونَ

﴿ قَالُواْ وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا لَهَا عَٰبِدِينَ ﴿٥٣﴾ قَالَ لَقَدْ كُنتُمْ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُمْ فِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٥٤﴾ قَالُوٓاْ أَجِئْتَنَا بِٱلْحَقِّ أَمْ أَنتَ مِنَ ٱللَّٰعِبِينَ ﴿٥٥﴾ قَالَ بَل رَّبُّكُمْ رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ٱلَّذِي فَطَرَهُنَّ وَأَنَا۠ عَلَىٰ ذَٰلِكُم مِّنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٥٦﴾ وَتَٱللَّهِ لَأَكِيدَنَّ أَصْنَٰمَكُم بَعْدَ أَن تُوَلُّواْ مُدْبِرِينَ ﴿٥٧﴾ فَجَعَلَهُمْ جُذَٰذًا إِلَّا كَبِيرًا لَّهُمْ لَعَلَّهُمْ إِلَيْهِ يَرْجِعُونَ ﴿٥٨﴾ قَالُواْ مَن فَعَلَ هَٰذَا بِـَٔالِهَتِنَآ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥٩﴾ قَالُواْ سَمِعْنَا فَتًى يَذْكُرُهُمْ يُقَالُ لَهُۥٓ إِبْرَٰهِيمُ ﴿٦٠﴾ قَالُواْ فَأْتُواْ بِهِۦ عَلَىٰٓ أَعْيُنِ ٱلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَشْهَدُونَ ﴿٦١﴾ قَالُوٓاْ ءَأَنتَ فَعَلْتَ هَٰذَا بِـَٔالِهَتِنَا يَٰٓإِبْرَٰهِيمُ ﴿٦٢﴾ قَالَ بَلْ فَعَلَهُۥ كَبِيرُهُمْ هَٰذَا فَسْـَٔلُوهُمْ إِن كَانُواْ يَنطِقُونَ ﴿٦٣﴾ فَرَجَعُوٓاْ إِلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ فَقَالُوٓاْ إِنَّكُمْ أَنتُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٦٤﴾ ثُمَّ نُكِسُواْ عَلَىٰ رُءُوسِهِمْ لَقَدْ عَلِمْتَ مَا هَٰٓؤُلَآءِ يَنطِقُونَ ﴿٦٥﴾ قَالَ أَفَتَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكُمْ شَيْـًٔا وَلَا يَضُرُّكُمْ ﴿٦٦﴾ أُفٍّ لَّكُمْ وَلِمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٦٧﴾ قَالُواْ حَرِّقُوهُ وَٱنصُرُوٓاْ ءَالِهَتَكُمْ إِن كُنتُمْ فَٰعِلِينَ ﴿٦٨﴾ قُلْنَا يَٰنَارُ كُونِي بَرْدًا وَسَلَٰمًا عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ ﴿٦٩﴾ ﴾

**(الانبياء: ٥١ ـ ٦٩) سەرەتا با ماناى ئايەتەكان بكەين:**

**واتە: (بە ڕاستى ئێمە ژيرى و هۆشمەنديمان پێشتر بە ئيبراهيم بەخشى، ئێمە چاك ئەومان دەناسى. كاتێك بە باوك و قەومەكەى دەوت: ئەم بتانە چين ئێوە هەميشە بە دەوريدا دێن و دەيانپەرستن!. لە وەڵامدا وتيان: ئێمە باووباپيرانمان بينيوە ئەمانەيان پەرستووە. ئيبراهيم وتى: بە ڕاستى ئێوە و باووباپيرانى ئێوە لە گومڕاييەكى ئاشكرادا بوون. خەڵكەكە وتيان: بە ڕاست، تۆ حەقيقەتت بۆ ئێمە هێناوە، يان گاڵتە دەكەيت؟! ئيبراهيم وتى: بەڵكو دەمەوێت تێتانبگەيەنم كە پەروەردگارتان پەروەردگارى ئاسمانەكان و زەوييە و**

بەدیهێناون و من لەسەر ئەو بیروباوەڕە لە شایەت و ئاگاکانم. پاشان ئیبراهیم سوێندی خوارد و وتی: بە خوا نەخشەیەك دەكێشم و داوێك دەنێمەوە بۆ بتەکانتان دوای ئەوەی ئێوە بەجێتانهێشتن و پشتتان هەڵکرد. پاشان هەمووی وردوخاش کرد جگە لە گەورەکەیان، بەڵکو کە گەڕانەوە (پرسیار بکەن) و ئیبراهیم ڕاستیان بۆ ڕوونبکاتەوە. بتپەرستان وتیان: ئەوەی ئەمەی کردووە بە خواکانمان، بەڕاستی لە ستەمکارانە!! هەندێکیان وتیان: بیستومانە لاوێك بە خراپە باسیان دەکات، پێی دەڵێن ئیبراهیم. وتیان: کەوابوو بیهێنن بە بەرچاوی خەڵکەوە با ئەوانیش ئاگادار بن و ببینن. وتیان باشە، ئەی ئیبراهیم ئایا تۆ ئەمەت کردووە بە خواکانمان؟! ئیبراهیم وتی: نەخێر هەر کاری ئەو بتە زلەیە، دە لێیانبپرسن ئەگەر قسە دەکەن و تێدەگەن!! لە دڵی خۆیاندا لێکیاندایەوە، سەرەنجام وتیان بە خۆیان: بەڕاستی ئێوە هەمیشە ستەمکارن. پاشان بە سەرشۆڕیی پاشگەز کرانەوە بۆ بیروباوەڕە کۆنەکەیان: بێگومان تۆ زانیوتە کە ئەوانە قسە ناکەن و تێناگەن!. ئیبراهیم وتی: باشە، ئاخر چۆن شتێك دەپەرستن لەجیاتی خوا، کە ناتوانێت هیچ جۆرە قازانج، یان زیانێکتان پێبگەیەنێت، ئۆف لەدەستان و لەو شتانەش کە لە جیاتی خوا دەیپەرستن، جا ئایا ئەوە تێناگەن و بیر و هۆشتان ناخەنە کار؟! هەندێکیان وتیان: ئیبراهیم بسووتێنن و پشتیوانی لە خواکانتان بکەن، ئەگەر ئێوە شتێکتان بۆ دەکرێت. وتمان: ئەی ئاگر سارد و سەلامەت بە لەسەر ئیبراهیم).

ئەنجا سەیری ئەم خاڵانەی خوارەوە بکە:

١ـ ﴿ وَتَٱللَّهِ لَأَكِيدَنَّ أَصْنَٰمَكُم بَعْدَ أَن تُوَلُّوا۟ مُدْبِرِينَ ﴾ واتە: (بە خوا نەخشەیەك دەكێشم و داوێك دەنێمەوە بۆ بتەكانتان، دوای ئەوەی ئێوە بەجێتانهێشتن و پشتتان هەڵکرد). بازدان بەسەر ئەوەدا و ئامارژەنەدان بەوەی ئیبراهیم ئەم قسەیەی بە نهێنی و لە دڵی خۆیدا وتووە، لەبەرئەوەی ناچێتە عەقڵەوە ئیبراهیم ئەم قسەیەی بە ئاشکرا وتبێت لەبەردەم قەومەکەیدا، کە قسەکە هەڕەشەیە بۆ سەر بتەکان، بەڵام ئەوان بەبێ خەم و بەبێ بەهەندوەرگرتنی هەڕەشەکە، بڕۆن بۆ گەشت و سەیرانی خۆیان.

٢ـــ ﴿ فَجَعَلَهُمْ جُذَٰذًا إِلَّا كَبِيرًا لَّهُمْ لَعَلَّهُمْ إِلَيْهِ يَرْجِعُونَ ﴾ واتە: (ئینجا هەمووی وردوخاش کرد جگە لە گەورەکەیان، بەڵکو کە گەڕانەوە (پرسیار بکەن) و ئیبراهیم ڕاستییان بۆ ڕوون بکاتەوە). لابردن و ئامارژەنەدان بەوەی کە ئیبراهیم چاوەڕێی کردووە تا قەومەکەی دەچن بۆ گەشت و ئاهەنگ، پاشان بتەکان پارچە پارچە دەکات.

٣ـــ ﴿ قَالُوا۟ مَن فَعَلَ هَٰذَا بِـَٔالِهَتِنَآ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ واتە: (وتیان: ئەوەی ئەمەی کردووە بە خواکانمان، بەڕاستی لە ستەمکارانە ! !)، لابردن و ئامارژەنەدان بەوەی کە ئیبراهیم پاش

شـكاندنی بتـەكان، لـە شـوێنی ڕووداوەكـە ڕۆیشـتووە و قەومەكـەی هاتوونەتەوە بۆ شوێنی ڕووداوەكە.

٤ـ ﴿ قَالُوٓاْ ءَأَنتَ فَعَلۡتَ هَٰذَا بِـَٔالِهَتِنَا يَٰٓإِبۡرَٰهِيمُ ﴾ واتـە: (وتیـان : باشە، ئەی ئیبراهیم ئایا تۆ ئەمەت كردووە بە خواكانمان؟!)، لابردن و ئاماژە نەدان بەوەی كە چاوەڕێیان كردووە تا ئیبراهیم بێت بـۆ شـوێنی ڕووداو، پاشان دەستیانكردووە بە لێكۆڵینەوە.

٥ـــ ﴿ ثُمَّ نُكِسُواْ عَلَىٰ رُءُوسِهِمۡ لَقَدۡ عَلِمۡتَ مَا هَٰٓؤُلَآءِ يَنطِقُونَ ﴾ واتــە: (پاشــان بــە ســەرشــۆڕیی پاشــگەز كرانــەوە بـۆ بیروبــاوەڕە كۆنەكەیان، بێگومان تۆ زانیوتە كە ئەوانـە قسـە ناكـەن و تێناگـەن!)، پـێش وشـەی: (لَقَدۡ عَلِمۡتَ ) ئـەوە لابـراوە و ئامـاژەی پێنـەدراوە كـە قسەكەر و قسەبۆكراو: موتەكەللـیم و موخاتـەب، كێیـە؟ بـەڵام بـەپێی سیاقی ڕووداوەكان، دەردەكەوێت كـە كەسـی "تـاك" لـە ناویانـدا هـەر ئیبراهیم بـووە، لەبەرئـەوە ڕانـاوی "علمـتَ" بـۆ ئـەو دەگەڕێتـەوە، بـە بێئەوەی پێشتر ئاماژەی بۆ بكات..

٦ـ ﴿ قُلۡنَا يَٰنَارُ كُونِي بَرۡدٗا وَسَلَٰمًا عَلَىٰٓ إِبۡرَٰهِيمَ ﴾ واتـە: (وتمـان: ئـەی ئاگر سارد و سەلامەت بە لەسـەر ئیـبراهیم). لابـردن و ئاماژەنـەدان بـە بازدان بەسەر ڕووداوەكاندا: بازدان بەسەر كات و بەسەر شوێن "زەمان و مەكان"، بۆ گواستنەوەی ڕووداوەكـان لـە شـوێنی ئاگركردنەوەكـە و هەڵدانی ئیبراهیم بۆ ناوی.

لێرەدا کەمێك لەسەر خاڵی یەکەم دەوەستین و بەراوردی دەکەین بە دوو چیرۆکی دیکەی قورئانی، کە بە پێچەوانەی ئەمەی ئیبراهیمەوە، وتووێژ "حیوار"ێکی لاوەکی تێدایە، بەڵام خوای گەورە بە روونی ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە ئەو حیوارە "بەنهێنی و لە دڵی خۆیاندا" روویداوە، بە پێچەوانەی ئەمەی ئیبراهیمەوە کە هیچ ئاماژەیەکی بەوە نەداوە کە ئیبراهیم لە دڵی خۆیدا ئەو هەڕەشەیەی کردووە... ئەوانیش چیرۆکی یوسف و مووسایە..

سەرەتا لە باسی یوسفدا کاتێك کە بنیامین گل دەداتەوە و لای براکانی دەڵێت دزی کردووە، براکانیشی دەڵێن ئەگەر بنیامین دزی کردبێت ئەوا پێشتریش برایەکی دیکەی هەبوو – کە مەبەست یوسفە ـ، ئەویش دزی کردووە.. ئا لێرەدا یوسف هیچ ناڵێت و لە دڵی خۆیدا دەڵێت بەڕاستی ئێوە زۆر خراپکارن.. ﴿ فَأَسَرَّهَا يُوسُفُ فِي نَفْسِهِۦ وَلَمْ يُبْدِهَا لَهُمْ ﴾، بەلام دیقەت بفەرموون، ئایەتەکە بە روونی دەفەرموێت: یوسف لە دڵی خۆیدا ئەو قسەیەی بە نهێنی کرد و لای ئەوان ئاشکرای نەکرد، جا بۆ زیاتر تەئکیدکردنەوە، هەر ئەوەندە بەس نییە کە بفەرموێت: یوسف بە نهێنی و لە دڵی خۆیدا ئەو قسەیەی کرد، بەڵکو بە ڕستەی ﴿ وَلَمْ يُبْدِهَا لَهُمْ ﴾، دووپاتی دەکاتەوە کە مانای ئەوە دەگەیەنێت بە هیچ جۆرێك قسەکەی بۆ براکانی ئاشکرا نەکرد..

لە باسی مووسا و جادووبازەکانیشدا — کە پێشتریش ئاماژەمان پێدا —، کاتێك جادووبازەکان ناکۆکیی دەکەوێتە نێوانیان، خوای گەورە بە ڕوونی ئاماژە بەوە دەکات کە ئەوان ناکۆکییەکانیان "بەنهێنی" هێشتەوە و نەیانهێشت مووسا و هاروون پێیبزانن، سەیرکەن دەفەرموێت: ﴿ فَتَنَٰزَعُوٓاْ أَمۡرَهُم بَيۡنَهُمۡ وَأَسَرُّواْ ٱلنَّجۡوَىٰ ﴾، دەفەرموێت: قسەکانیان بەنهێنی کرد..

جا پرسیارەکە ئەمەیە: بۆچی لە چیرۆکی یوسف و مووسادا ئاماژە بەوە دەکرێت کە ئەو دوو حیوارە بە نهێنی کراون، بەڵام لە باسی ئیبراهیمدا ئەو ئاماژەیە بۆ حیواری "سوێند بەخوا بتەکانتان تێکدەشکێنم" نەکراوە؟..

ئەمە وەڵامەکەیە:

١ـ لە چیرۆکی یوسفدا، یوسف لە پێگەی هێز و تواناداییە و عەزیزی میسرە و لە هیچ ناترسێت. براکانیشی لە پێگەیەکی بێهێزیی و بێتوانایی و هەژاریی و تۆمەتباربووندان.

٢ـ لە چیرۆکی مووسادا، جادووبازەکان گرووپێکی بەهێزن و خاوەن دەسەڵاتن و پشتیان بە هێزێکی گەورەی وەك هێزی فیرعەون بەستووە، بەڵام مووسا و هاروون، دوو کەسی تەنها و بێهێز و غەوارەن.

٣ــ لە چیرۆکی ئیبراهیمدا، قەومەکەی لە پێگەی بەهێز و دەسەڵاتدان، بەڵام ئیبراهیم گەنجێکی تەنها و لاوازە و هیچ پشت و پەنایەکی نییە.

جا لـه هـەردوو چـیرۆکی یوسـف و مووسـادا، دەبیـنین کـە یوسـف، هەروەها گرووپە جادووبازەکە، بەهێز بوون، جا ئەگەر هـیچ ئاماژەیـەك نەبێت بۆ ئەوەی کە ئەوان قسەکەیان "بە نهێنی" کردووە، ئەوا بە هۆی بـەهێزیی پێگەکەیانـەوە وا دەردەکـەوێت کـە بـە ئاشـکرا قسـەکانیان کردووە و ترسیان لە کەس نەبووە، ئەمەش لەگەڵ ڕێڕەوی چیرۆکەکاندا ناگونجێت، لەبەرئەوەی ئەگەر یوسف بە ئاشکرا ئەو قسەیەی بکردایـە، ئەوا براکانی پێیاندەزانی و ئەو نەخشـەیەی کـە دایڕشـتبوو بـۆ هێنـانی باوك و کەسوکاری، هەڵدەوەشایەوە، چونکە هەر کاردانەوەیەکی یوسف بەرانبـەر بـەو قسـەیەی براکـانی کـە وتیـان برایـەکی دزی دیکەیشـی هەبووە، دەبووە هۆی هەڵوەشـانەوەی نەخشـەکەی، هـەروەها لـەوەی جادووگەرەکاندا، ئەگەر ئاماژە نەدرایە بەوەی کە بەنهێنی حیوارەکەیان کردووە، ئەوا ناکۆکییەکەیان ئاشکرا دەبوو بۆ مووسا و هاروون و دەبوو بە خاڵی لاوازیان(*) ..

---

(*) **سەرنجێکی گرنگ**: بە باشی دەزانم لێرەدا وەك ئاماژەمان بۆ بەراوردێکی نێوان چیرۆکی یوسف و مووسا کردووە، ئاماژەکەمان درێژتر بکەینەوە و ئەو بەراوردە فراوان بکەین لەنێوان ئەو دوو چیرۆکەدا کە لە قورئاندا یەکەمیان سوورەتێکی تەواوی بۆ تەرخانکراوە و دووەمیشیان زۆرترین باسوخواسی هەیە لە سوورەتەکاندا. چیرۆکی یوسف و باوك و براکانی بە درێژیی لە سوورەتی یوسفدا باسکراوە و چیرۆکی مووساش بەشێکی بەرفراوانی لە سوورەتی (القصص)دا باسکراوە بەتایبەتی سەردەمی منداڵی و دایکی و خوشکەکەی و فیرعەون و ژنەکەی فیرعەون و....هتد.

نوعمان عەلی خان کە بانگخوازێکی ئەمەریکیی بە ڕەگەز پاکستانییە و ئێستا لە ویلایەتی تەکساسی ئەمەریکا سەرۆکی سەنتەری (البینة)یە، لە بەرنامەی "بالقرآن اهتدیت" بەراوردێك دەکات لە نێوان هەردوو سوورەتی یوسف کە باس لە چیرۆکی یوسف دەکات، لەگەڵ سوورەتی (القصص) کە باس لە چیرۆکی مووسا دەکات لە منداڵییەوە. لەو بەراوردە سەرنجڕاکێشانە:

١ـ سوورەتی یوسف بە گوزارشتی "أحسن القصص" دەستپێدەکات، سوورەتی (القصص)یش خۆی ناونراوە (القصص)، کەواتە شتێك هەیە ئەم دووانە بە یەکەوە دەبەستێتەوە.

٢ـ سوورەتی یوسف، چیرۆکی کوڕ و باوکێکە (یوسف و باوکی)، سوورەتی (القصص) چیرۆکی کوڕ و دایکێکە (مووسا و دایکی). واتە لە یوسفدا باسی (دایك) ونە و لە (القصص) دا باسی (باوك) ونە.

٣ـ لە یوسفدا، باوکەکە خۆشەویستیی خۆی بۆ کوڕەکەی: یوسف، دەردەخات. لە (القصص)دا دایکێك خۆشەویستیی خۆی بۆ کوڕەکەی: مووسا، دەردەخات.

٤ـ لە یوسفدا، کوڕەکە: واتە یوسف، دەخرێتە بیرەوە، لە (القصص)دا کوڕەکە: مووسا، دەخرێتە ڕووبارەوە.

٥ـ لە یوسفدا، ئەم کوڕە چەندین ساڵ لە باوکی دادەبڕێت، لە (القصص)دا ئەم کوڕە: مووسا، ماوەیەکی زۆر کەم لە دایکی دادەبڕێت.

٦ـ لە یوسفدا، هۆکاری جیابوونەوەی باوك و کوڕەکە، براکانە. لە (القصص)دا هۆکاری بەیەکگەیشتنەوەی دایك و کوڕەکە، خوشکە (خوشکەکەی مووسا)یە.

٧ـ لە یوسفدا، کوڕەکە لە بیرێکدا دەهێنرێتە دەرەوە، لە (القصص)دا کوڕەکە لە ڕووبارێکدا دەهێنرێتە دەر.

٨ـ یوسف، دەردەهێنرێت لەبیرەکە و دەبرێتە ناو کۆشکێك لە میسر. مووسا لە ڕووبارەکە دەردەهێنرێت و دەبرێتە کۆشکێك لە میسر.

٩ـ یوسف، (عەزیزی میسر، واتە مێردی زولەیخا) دەیکڕێت و دەیباتەوە بۆ ژنەکەی. مووسا، ژنی فیرعەون دەیدۆزێتەوە و دەیبات بۆ مێردەکەی. واتە: یوسف، پیاوێك دەیباتەوە بۆ لای خێزانەکەی. مووسا، ژنێك دەیباتەوە بۆ لای مێردەکەی.

١٠- عەزیزی میسر کە یوسف دەباتەوە بۆ لای خێزانەکەی، دەڵێت: (عَسَىٰٓ أَن يَنفَعَنَآ أَوۡ نَتَّخِذَهُۥ وَلَدٗا). واتە: بەڵکو سوودمان پێبگەیەنێت، یان بیکەین بە کوڕی خۆمان. ژنەکەی فیرعەونیش کە مووسا دەباتەوە بۆ لای فیرعەون بەهەمانشێوە و- پاش چەندین سەدە - هەمان قسە دەقاودەق دەڵێتەوە: (عَسَىٰٓ أَن يَنفَعَنَآ أَوۡ نَتَّخِذَهُۥ وَلَدٗا).

١١- هەردوو یوسف و مووسا لە میسر، تووشی بەڵا و تاقیکردنەوە بوون: یوسف لە لایەن زولەیخاوە داوای کاری خراپەی لێکرا و مووساش تووشی ڕووداوی کوشتن بوویەوە و زەلامێکی کوشت. بەلاکەی یوسف "زینا" بوو، بەلاکەی مووسا "کوشتن" بوو.

١٢- یوسف، (لەناو کۆشکدا) تووشی ئەو بەڵا و تاقیکردنەوەیە بوو. مووسا لە دەرەوەی کۆشك و (لەناو بازاڕدا) تووشی ئەو بەلایە بوو.

١٣- یوسف هەڵەکەی نەکرد: واتە: داوێنپیسی نەکرد. مووسا (سەلامی خوای لێبێت) مرۆڤەکەی کوشت و هەڵەکەی کرد.

١٤- ئەوەی کە هەڵەکەی نەکرد، واتە: یوسف، دەستگیر کرا و زیندانی کرا، بەڵام ئەوەی کە هەڵەکەی کرد، واتە: مووسا، لە جیاتی زیندانیکردن، ڕایکرد و هەڵهات لە شار. واتە بێتاوان زیندانی کرا و هەڵەکاریش هەڵهات.

١٥- هەردووکیان شایەت لەسەر کارەکە هەبوو، لە سوورەتی یوسفدا شایەتیدەر لە بەرژەوەندیی یوسف شایەتی دا، لە سوورەتی (القصص)دا شایەتیدەر لە دژی مووسا شایەتی دا (دەتەوێت منیش بکوژیت وەك چۆن دوێنێ یەکێکت کوشت؟).

١٦- چیرۆکی یوسف، لە دەرەوەی میسر دەستپێدەکات و لە میسر کۆتایی دێت. چیرۆکی مووسا لە میسر دەستپێدەکات و لە دەرەوەی میسر کۆتایی دێت.

جا، جیاواز لەو بەراوردەی ئەو بانگخوازە، دیقەت دەدەین بە شێوەیەکی گشتی چیرۆك و بەسەرهاتی ئەو دوو پێغەمبەرە چەند جیاوازییەکی دیکە و خاڵی هاوبەشیان هەیە، لەوانە:

١- یوسف، (سەلامی خوای لێبێت) لە حەسوودیی بردنی براکانیدا خرایە بیرەوە، بەڵام مووسا لە خۆشەویستییدا دایکی خستییە ڕووبارەکەوە، واتە: یەکەم بۆ لەناوبردنی خرایە بیر، بەڵام دووەم بۆ ڕزگارکردنی خرایە ڕووبار. یەکەم بە دەستێکی پڕ لە ڕق و کینە خرایە بیرەوە،

(وَأَلْقُوهُ فِي غَيَٰبَتِ ٱلْجُبِّ)، بەڵام دووەم بە دەستێکی پڕ لە میهری دایکایەتی خرایە ڕووبارەوە. (فَأَلْقِيهِ فِي ٱلْيَمِّ).. چەند جیاوازن ئەو دوو وشەیەی (وَأَلْقُوهُ) (فَأَلْقِيهِ)...!!

٢ـ یوسف، دە برای هەبوون، بەڵام دوژمنی بوون، بەڵام مووسا یەك برای هەبوو، بەڵام پشت و پەنا و لایەنگری بوو.

٣ـ یوسف، نەوەی ئیسرائیلی لە دەرەوەی میسر هێنا بۆ میسر، بەڵام مووسا نەوەی ئیسرائیلی لە میسرەوە بردەوە بۆ شوێنی خۆیان بۆ دەرەوەی میسر.

٤ـ یوسف کە خرایە بیرەوە، بە بەرنامە و پلانی مرۆڤ ئەو کارە دژی کرا، بەڵام مووسا کە خرایە ڕووبارەوە بە بەرنامە و کاری پەروەردگار بوو.

٥ـ ژنی خاوەن کۆشك (زولەیخا) سەرچاوەی ئازار و نیگەرانی بوو بۆ یوسف. ژنی خاوەن کۆشك لای مووسا، سەرچاوەی ئارامی و ئاسایش بوو بۆ مووسا.

٦ـ کە گەورە بوون و پێگەیشتن، خوای گەورە بە دوو ئایەتی هاوشێوە باس لە گەورەبوون و پێگەیشتنیان دەکات: بۆ یوسف دەفەرموێت: (وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥٓ ءَاتَيْنَٰهُ حُكْمًا وَعِلْمًا ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٢٢﴾)، بۆ مووساش دەفەرموێت: (وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ وَٱسْتَوَىٰٓ ءَاتَيْنَٰهُ حُكْمًا وَعِلْمًا ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٤﴾). کە پێشتریش باسمان لەم دوو بەراوردە لەگەڵ چیرۆکی یەحیادا کرد.

٧ـ باوکی یوسف، واتە یەعقوب، خوای گەورە باسی بێتاقەتبوون و ئازاری دوور لە یوسفی لە قورئاندا کردووە: (يَٰٓأَسَفَىٰ عَلَىٰ يُوسُفَ وَٱبْيَضَّتْ عَيْنَاهُ مِنَ ٱلْحُزْنِ)، چاوەکانی لە تاو خەفەت کوێر بوون و ئاوی سپییان دەرکرد. دایکی مووساش خوای گەورە باسی بێتاقەتبوون و ئازاری دوور لە مووسای لە قورئاندا کردووە: (وَأَصْبَحَ فُؤَادُ أُمِّ مُوسَىٰ فَٰرِغًا).

جا ئێستا با بپرسین، ئایا حیکمەت و سوود لەم بەراوردە و لەیەکچوونەی نێوان بەسەرهاتی ئەم دوو پێغەمبەرە بەڕێزە، چییە؟ بە کورتی ئاماژە بە چەند خاڵێك دەدەین:

١ـ کاتێك ئەم بەراوردە دەکەین، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە مرۆڤ کاتێك دێتە ژیانەوە بەریەککەوتنی دەبێت لەگەڵ دەوروبەرەکەیدا: لەگەڵ دایك، باوك، برا، خوشك.. فێرمان دەکات چۆن هەڵسوکەوت بکەین لە بارودۆخە جیاوازەکاندا.

بەڵام ئیبراهیمی تەنها (سەلامی خوای لێبێت)، ئەو گەنجە هەژارەی تەنها پشتی بە خوا بەستووە، دەسەڵاتی بە سەر گەلەکەیدا نییە، ناشتوانێت بە ئاشکرا رکابەرییان بکات و پێیان بڵێت: سوێند بێت بتەکانتان بشکێنم، گوێگریش چاك ئەوە دەزانێت، جا ئەگەر گێڕەرەوەی چیرۆکەکە لێرەدا حیوارەکە بپچڕێنێت و بڵێت: "ئیبراهیم بەنهێنی و لە دڵی خۆیدا وتی": سوێندبێت بتەکانتان بشکێنم...، کە پێویست ناکات، ئەوا ئەو پچڕانە دەبێتە هۆی تانەدان لە خوێنەر کە کەسێکی گەمژەیە و لەوە تێناگات ئەو قسەیەی ئیبراهیم لەو پێگە

---

٢ـ مرۆڤ، لە ژیانیدا بە چەندین قۆناغدا تێپەڕدەبێت، بێدەسەڵات و بێهێز، جارێك لە بنی بیرێك و جارێك لە کۆشك و تەلاردا، جارێك لەناو ڕووبار و ئاودا و جارێك کوڕی نازدارەی گەورە بەرپرسان. فێرمان دەکات کە ئەگەر هەریەکێك لە ئێمە کەوتە بارودۆخێکی لەم شێوازانەوە، چۆن هەڵسوکەوت بکات. دیقەتی یوسف بدە: لەناو زینداندایە ناوی "یوسف"ـە و کاتێکیش بووەتە گەورە و عەزیزی میسر هەر خۆی بە ناوی خۆیەوە ناودەبات و پێشگری "گەورە و بەڕێز و خاوەن شکۆ" بە خۆیەوە نانێت: (أَنَا۠ يُوسُفُ وَهَـٰذَآ أَخِى).

٣ـ فێرمان دەکات کە چۆن خوا هەمیشە لەگەڵ بەندەکانیدایە، لە ناو شار و وڵاتی خۆت بیت، یان لە تاراوگە و ئاوارەیی، ئەوە خوایە فێرمان دەکات کە چۆن یوسف لە بیر و، مووسا لە ڕووبار، دێنێتەدەر و دەیانکات بە کوڕی نازدارەی کۆشك. هەر ئەویشە کە ویستی لەسەر بێت لە کوڕی نازدارەی کۆشکەوە گۆڕانکاریی بە بارودۆخی ژیانیان دەکات و دەیانباتە کونجی زیندان، یان ئاوارەی دوورە وڵات: وەك مووسا کە لە کوڕی بەخێوکراوی فیرعەونەوە ئاوارە بوو، ناچار شوانیی دەکرد. دواتریش جارێکی دیکە ڕەوشەکە دەگۆڕێت و لە کونجی زیندانەوە پەیامێك بە خەونێکی نیوەشەوی تاریکدا ڕەوانەی بیر و فیکری پادشا دەکات و بەوەش یوسف لە کونجی زیندانەوە دەگوازێتەوە بۆ گەورەیی و عەزیزیی. کەواتە هەموو کاروبارەکان بە دەست هەڵسوڕێنەری مەزنەوەیە: (بيده الأمر كله).

لاوازەدا، حەتمەن بە نهێنی و لە دڵی خۆیدا بووە، ئیتر چ پێویست بەوە دەکات بوترێت ئیبراهیم لە دڵی خۆیدا وتوویەتی. لەبەرئەوە لە چیرۆکی ئیبراهیمدا ئەو بەشە نەوتراوە و تەنها وتەکەی ئیبراهیم هاتووە، تا گوێگر خۆی ئەو مانایە هەڵگۆزێت لە چیرۆکەکەدا بە پشتبەستن بە تێگەیشتنی خۆی لە سیاقی چیرۆکەکە. جێی سەرنجە، ئەمە خۆی لە خۆیدا جۆرێکە لە ڕێزگرتنی خوای گەورە لە مرۆڤ، لە "گوێگر و بیسەرانی قورئان"، کە لە پلەی "ژیر و تێگەیشتوو" (اللّبیب) دایناون و پێویستی بەوە نەکردووە پێیان بفەرموێت ئیبراهیم بە نهێنی ئەو قسەیەی کردووە، چونکە گوێگر خۆی ژیرە و لە سیاقەکە، ئەو مانایە هەڵدەگۆزێت..

**هەر لێرەوە** ناچارین داخڵی چیرۆکێکی دیکەی قورئان بین، کە پەیوەندیی بە "بازدان بە ڕووداو لە ڕێی گۆڕینی حیواری ئاشکرا بۆ حیواری نهێنی" هەیە، ئەویش چیرۆکی دروستکردنی ئادەم و کڕنووش نەبردنی ئیبلیسە. دیقەتی ئەم ئایەتانە بدەن: ﴿قَالَ ءَأَسۡجُدُ لِمَنۡ خَلَقۡتَ طِينٗا ﴿٦١﴾ قَالَ أَرَءَيۡتَكَ هَٰذَا ٱلَّذِي كَرَّمۡتَ عَلَيَّ لَئِنۡ أَخَّرۡتَنِ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ لَأَحۡتَنِكَنَّ ذُرِّيَّتَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلٗا ﴿٦٢﴾﴾ (الإسراء: ٦١- ٦٢)، جا با لە واتا کوردییەکەی وردببنەوە: "ئیبلیس وتی: ئایا چۆن سوژدە دەبەم بۆ ئەو کەسەی کە لە قوڕ دروستت کردووە؟. وتی: پێم بڵێ ئا ئامەیە کە ڕێزت داوە بەسەر مندا؟، سوێند بێت ئەگەر دوامبخەیت تا ڕۆژی

قیامەت، ئەوە بێگومان هەموو نەوەکانی گومڕا و سەرگەردان دەکەم، جگە لە کەمێکیان"...

لێرەدا تێبینی ئەوە دەکەین کە دوو جار وشەی "قال" هاتووە، واتە "ئیبلیس وتی"، لەکاتێکدا بکەری کردارەکە واتە قسەکەرەکە هەر یەک کەسە و ئیبلیسە، دەی بۆچی لە دوای چوار وشە خوای گەورە جارێکی دیکە وشەی "قال"ی دووبارە کردووەتەوە؟، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئیبلیس ڕستەی یەکەمیانی بە ئاشکرا وتووە لە وەڵامی ئەو پرسیارەی پەروەردگاردا کە پێی فەرمووە: بۆچی کڕنووشت بۆ ئادەم نەبرد؟، ئەویش بە ئاشکرا لە وەڵامدا وتوویەتی: چۆن کڕنووش دەبەم بۆ ئەو کەسەی لە قوڕ دروستت کردووە. تەواوکەری باسەکە دیسانەوە دەفەرموێت: ئیبلیس وتی، بۆچی دووبارەی کردووەتەوە، بێگومان لەبەر ئەوەی کە ئیبلیس ئەمجارە ڕستەی دووەمی بە ئاشکرا نەوتووە، بەڵکو بە نهێنی و لە دڵی خۆیدا وتوویەتی: "پێم بڵێ ئا ئامەیە کە ڕێزت داوە بەسەر مندا؟، سوێند بێت ئەگەر دوامبخەیت تا ڕۆژی قیامەت ئەوە بێگومان هەموو نەوەکانی گومڕا و سەرگەردان دەکەم جگە لە کەمێکیان"، بەڵکو ئیبلیس بوێریی ئەوەی نەبووە بە ئاشکرا ئەو قسەیە لە بەرانبەر پەروەردگاردا بدرکێنێت، واتە دیقەت بدەن چۆن بازدان لە حیواری ئاشکرا بۆ حیواری نهێنی و پەنهان دروستبووە تەنها بە وشەیەک: **"قال"ی دووەم. جیاوازیی ئەم باسە و ئەوەی ئیبراهیم لەوەدایە کە:** قەومی ئیبراهیم زانستی پەنهان "عیلمی غەیب"یان

نەدەزانی تا بزانن کە ئیبراهیم لە دڵی خۆیدا هەڕەشەی شکاندنی بتەکانی کردووە، بەڵام پەروەردگاری ئاگادار بە نهێنی و ئاشکرا، ئاگادارە بە قسەکەی ئیبلیس کە لە دڵی خۆیدا دەڵێت دەبێت نەوەکانی ئادەم بخەڵەتێنم، لەبەرئەوە بۆ ئێمەیشی دەگێڕێتەوە، هێندە ئاگاداری هەموو شتێکە وەك ئەوە وایە ئیبلیس بە ئاشکرا ئەو قسەیەی کردبێت.

هەر لەم رووەوە، بەبێ درێژەدان بە باسکردنی، ئاماژە بۆ چیرۆکی سولەیمان (سەلامی خوای لێبێت) لەگەڵ شاژنی سەبەء دەکەین، ئەو کاتەی شاژن بڕیار دەدات سولەیمان تاقی بکاتەوە بزانێت ئایا لەبەر پارە و پول داوای مسوڵمانبوون لە خەڵکی یەمەن دەکات، یان لەبەر ئەوەی بە ڕاستی پێغەمبەر و نێردراوی خوایە. شاژن بۆ ئەو مەبەستە دیاری دەنێرێت بۆ سولەیمان، جا با بزانین چی روودەدات، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَلَمَّا جَآءَ سُلَيْمَٰنَ قَالَ أَتُمِدُّونَنِ بِمَالٍ فَمَآ ءَاتَىٰنِۦَ ٱللَّهُ خَيْرٌ مِّمَّآ ءَاتَىٰكُم بَلْ أَنتُم بِهَدِيَّتِكُمْ تَفْرَحُونَ ﴿٣٦﴾ ٱرْجِعْ إِلَيْهِمْ فَلَنَأْتِيَنَّهُم بِجُنُودٍ لَّا قِبَلَ لَهُم بِهَا وَلَنُخْرِجَنَّهُم مِّنْهَآ أَذِلَّةً وَهُمْ صَٰغِرُونَ ﴿٣٧﴾ قَالَ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَؤُا۟ أَيُّكُمْ يَأْتِينِى بِعَرْشِهَا قَبْلَ أَن يَأْتُونِى مُسْلِمِينَ ﴾ (النمل: ٣٦ ـ ٣٨)، واتە: (جا کاتێك (نوێنەری) نێردراوەکان گەیشتە لای سولەیمان، وتی: ئێوە دەتانەوێت بە ماڵ و سامان و دیاری کۆمەکیم بکەن؟! من دڵنیام کە ئەو شتانەی خوا پێیبەخشیوم لەوە چاکتر و بە نرخترە کە بە ئێوەی بەخشیوە، نەخێر من بەو دیارییە دڵشاد نابم، بەڵکو ئێوە بە دیارییەکەتان شاد دەبن.

بگەڕێرەوە بۆ لایان بە خۆت و دیارییەکەتەوە، بەدڵنیاییەوە دەبێت بە سەربازانێکەوە بچینە سەریان کە نەیاندیبێت و نەتوانن بەرگری بکەن، دەبێت دەریان بکەین لە وڵاتیان لەکاتێکدا ئەوان زەلیل و ڕیسواو شکاون. وتی: ئەی خەڵکینە کامتان دەتوانێت تەختی شاژنە بەڵقیسم بۆ بهێنێت پێش ئەوەی بێن بۆ لام و موسڵمان ببن).

لێرەدا قسەکەر بەردەوام هەر سولەیمانە، بەڵام لە ئایەتی کۆتاییدا وشەی **"قال"** دووبارە بووەتەوە، لەکاتێکدا ـ وەك وتمان ـ قسەکەر یەك کەسە، بۆچی؟ لەبەرئەوەی لە ڕستەی کۆتاییدا "شوێن و کات و بابەت و کەسەکان و هەڵوێستەکە"، هەمووی گۆڕاوە. لە بەشی سەرەتادا: قسەکەر سولەیمانە، بەڵام قسەلەگەڵکراو نوێنەرانی شاژنن، شوێن: شوێنی کۆبوونەوەی سولەیمانە لەگەڵ وەفدەکە، بابەت: هێنانی دیارییە بۆ سولەیمان.. بەڵام لە ئایەتی کۆتاییدا: تەنها قسەکەر سولەیمانە، ئیتر ئەوانی دیکە گۆڕدراون: قسە لەگەڵکراو: نزیکانی سولەیمانن، شوێن: کۆبوونەوەی سولەیمان لەگەڵ نزیکانی خۆیدا. بابەت: هێنانی کورسیی حوکمڕانیی شاژن بۆ لای سولەیمان. کات: دوای گەڕانەوەی وەفدەکە بۆ سەبەء و هاتنی هەواڵ کە شاژن خۆی بە مسوڵمانی دێت بۆ لای سولەیمان... هەموو ئەو بازدانە بە یەك وشە جێی کراوەتەوە: **"قال"** لە ئایەتی کۆتاییدا... جا ئیتر ورد بەرەوە و دیقەت بە، بزانە مرۆڤ دەتوانێت خۆی ڕابگرێت لەبەردەم گەورەیی بەلاغەتی ئەم قورئانەدا؟!

جا با پێش ئەوەی ئەم باسە تەواو بکەین، **دوو نموونەی** دیکە باس بکەین کە زۆر پڕ وردەکارییێن و پێویست بە وردبوونەوە دەکات و پەیوەندیدارن بە "لابردن و قرتاندنی ناوبەین لە حیواری بەیەکەوە بەستراو"دا:

یەکەم: خوای گەورە لە بارەی مووسا و فیرعەونەوە دەفەرموێت: ﴿ فَلَمَّا جَآءَهُمُ ٱلۡحَقُّ مِنۡ عِندِنَا قَالُوٓاْ إِنَّ هَٰذَا لَسِحۡرٞ مُّبِينٞ ٧٦ قَالَ مُوسَىٰٓ أَتَقُولُونَ لِلۡحَقِّ لَمَّا جَآءَكُمۡۖ أَسِحۡرٌ هَٰذَا وَلَا يُفۡلِحُ ٱلسَّٰحِرُونَ ٧٧ ﴾ (یونس: ٧٦ - ٧٧)، واتە: کاتێك حەقیان لە لایەن ئێمەوە لە ڕێگەی مووساوە بۆ هات، وتیان بەڕاستی ئەمە جادوویەکی ئاشکرایە، مووسا وتی: باشە ئێوە بەم حەقیقەت و ڕاستییەی کە بۆمهێناون دەڵێن:...؟، ئایا ئەمە جادووە؟، خۆ جادووگەران سەرفراز نابن...". زۆرینەی ڕاڤەکارانی قورئان دەڵێن: قسەکەی مووسا حەزفکراوە، کە دەڵێت: باشە ئێوە بەم حەقیقەت و ڕاستییەی بۆمهێناون دەڵێن:..؟، دەڵێن چی؟، واتە "مەفعول بە"ی فیعلی "تقولون"، مەحزوفە... بۆچی؟

هۆکارەکەی ئەوەیە ئەو حەذفکردنە پەیوەندیی بە لایەنی دەروونیی قسەکەرەوە هەیە، کە مووسایە (سەلامی خوای لێبێت)، واتە هەستی دەرونیی مووسا وایکردووە قسەکە لەو شوێنەدا لەسەر زمانی بیبەستێت و نەتوانێت وتەکە تەواو بکات.. ئەمە چۆن؟

مووسا (سەلامی خوای لێبێت) زمانی دەیگرت، خوای گەورە هاروونی برای کردە وەزیری، لەبەر ئەوەی زمانپاراوتر بوو لە مووسا، وا

باسدەکرێت کە ئەو گرێیەی زمانی، واتە "زمانگرتن"ـەکەی، بە تەواویی پاك نەبووەتـەوە، بـەڵکو بەشـێکی کـەمی ئـەو زمانگرتنـەی هـەرمابوو، لەبـەر ئـەوەی کاتێـك نـزای کـرد، فـەرمووی: ﴿ وَٱحۡلُلۡ عُقۡدَةٗ مِّن لِّسَانِي ﴾، "گرێیەکی زمانم بکەرەوە"، واتە نەیوت: (عقدة لساني): "گرێی زمانم"، خـوای گـەورەش وەڵامـی دایـەوە و گرێیـەکی زمـانی بـۆ کـردەوە، هەندێکیشی تا خوا ویستی لەسەربوو مابوو...

مووسا (سەلامی خوای لێبێت) بەوە ناسـرابوو کـە لەسـەر حـەق زوو تـووڕە دەبـوو و هەڵدەچـوو، بەشـێوەیەك کاتێـك زانـی "سـامری" هۆزەکـەی خەڵەتانـدووە و فێـری "گوێرەکـە پەرسـتی" کـردوون، ئـەو لەوحانەی کە تەوراتی تێدا نووسـرابوو فڕێیـدا و سـەری هـاروونی بـرای گرت و بە ڕیش ڕایکێشا هێندە تووڕەبوو، تەنانەت خوای گـەورە باسـی ئەوەی کردووە کە ﴿ وَلَمَّا سَكَتَ عَن مُّوسَى ٱلۡغَضَبُ ﴾، واتـە: کاتێـك تووڕەیی مووسا هێوربوویەوە، واتە هەمیشە لەسەر حـەق هەڵدەچوو و تووڕە دەبوو، بە جۆرێك هێندەی نەدەما کۆنترۆڵی خۆی لەدەست بدا، جا چ ئەگەر نەخۆشی و گرێیەك لە زمانیشیدا هەبووبێت؟!

جا لە ڕۆشنایی ئەم زانیارییانەدا، دەتوانین تێشك بخەینە سـەر ئـەم هەڵوێسـتە کـە مووسـا لەبـەردەم فیرعـەون و گـەورە پیـاوانی کۆشـکدا وەسـتاوە و بانگیـان دەکـات بـۆ یەکتاپەرسـتی و بەڵگـە و ئایەتـەکانی خوایـان نیشـان دەدات، بـەڵام ئـەوان پێیـدەڵێن: ئەمـە جادوویـەکی ئاشکرایە. مووسا زۆر لەسەر دڵی قورس دەبێت، کە ئەوان بـەو حـەق و

ڕاستییە دەڵێن جادوو، دەیەوێت بیانگێڕێتەوە لەو قسەیان، پێیان دەڵێت: باشە ئێوە بەم حەقیقەت و ڕاستییەی کە بۆمهێناون دەڵێن:.......؟، پاشان قسەکە لەسەر زمانی قورس دەبێت و بۆینایەت، لەبەر ناشیرینی ئەو باسوخواسە و دووریی ئەو حەقە لە جادوو، لەوێدا بێدەنگ دەبێت و پاشان هەموو هێزی خۆی کۆدەکاتەوە و لێیان دەپرسێت: ﴿أَسِحۡرٌ هَٰذَا﴾، ئایا ئەمە جادووە؟... جا قسەکە وا دەردەکەوێت وەك بڵێی شتێك حەزفکراوە و لابراوە، بەڵام ئەوە لابردن نییە، بەڵکو پچڕانە، لەبەر چی؟ لەبەر ئەو توونديی کاردانەوە و هەڵچوونەی مووسا بە هۆی قێزەونی وەسفەکەی ئەوان بۆ حەق، کە بە "جادوو"ی دەزانن، مووسا قسەکەی لەسەر زمان دەیبەستێت، لەبەرئەوەی ناتوانێت وەك ئەوان بڵێت ئەم حەق و ڕاستییە، جادووە. وەك بڵێی مووسا دەیەوێت بڵێ: باشە ئێوە بەم حەقیقەت و ڕاستییەی کە بۆمهێناون دەڵێن: **جادوو**؟، بەڵام لەبەر قێزەونی ئەو وەسفە ناتوانێت بڵێت: جادوو، لەبەرئەوە قسەکەی دەبڕێت... هەموو ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەو قسەیەی ئەوان چەندە قورس بووە لەسەر دڵی مووسای سەروەرمان.

دووەم: بە کورتی لێی دەدوێین، ئەویش فەرموودەی سەروەرمان (لوط) (سەلامی خوای لێبێت) کاتێك فریشتەکان دەبنە میوانی و قەومەکەی کە کاری خراپ و هاوڕەگەزباز بوون، دەزانن (لوط) میوانی نێرینەی هاتووە، دەچنە سەری، (لوط) لەو کاتەدا دەڵێت: ﴿قَالَ لَوۡ أَنَّ

لِي بِكُمۡ قُوَّةً أَوۡ ءَاوِيٓ إِلَىٰ رُكۡنٖ شَدِيدٖ ﴾ (هود: ٨٠) واته: (خۆزگه له خۆتان هێزێکم دەبوو، یان پەنایەکی بەهێزم دەستدەکەوت....)، ئیّ دواتر چی؟، ئەگەر هێزێکی بوایە یان پەنایەکی بەهێزی هەبووایە چی دەکرد؟ لێرەشدا وەڵامەکە حەزف بووە، لە ڕێزمانی عەرەبیدا دەڵێین: جەوابی "لو" مەحزوفە. بەڵام کاتێك ورد دەبینەوە دەبینین (لوط) (سەلامی خوای لێبێت) کە ئەو دیمەنە دەبینێت میوانی هەیە و خەڵکەکەش دەوری ماڵەکەیان داوە و دەیانەوێت هێرش بکەنە سەر میوانەکانی، لە ناخی دڵییەوە و لە دڵ و هەناوییەوە هەناسەیەك هەڵدەکێشێت و ئاوات دەخوازێت ئەگەر هێزێکی هەبوایە، یان پەنایەکی بەهێزی هەبوایە ئەوا...... ، پاشان ئیتر قسەکەی بۆ تەواو ناکرێت، لەبەر ئەو خەم و خەفەتەی کە ڕووی تێکردووە، بەڵام خوێنەر خۆی بە هۆی تێگەیشتنی لە سیاقی ڕووداوەکان تێدەگات کە ئاواتەکەی (لوط) چییە و دەیەوێت چی بڵێت...

# بەشی یەکەم

# بنیاتی دیمەنی چیرۆکەکان لە نێوان "لابردنی"ی وشەی "قـال" و دووبـارەکردنەوەیدا

لەڕاستیدا بەکارهێنانی وشەی "قـال" و موشـتەقاتەکانی، لـە چـەند ئاستێکدا خۆی دەبینێتەوە، لەوانە: باسکردنی وشەکە، یـان لابردنـی و گۆڕینی بە وشەیەکی دیکە، یان لابردنی، یاخود چەندجار لابردنـی یـەك لەدوای یەك، یان باسکردن و دووبارەکردنەوەی یەك لەدوای یەك، یاخود باسکردنی بەشێوەی بکەر نادیار، هەریـەك لـەم ئاسـتانەش کاریگـەریی خۆیان هەیە لەسەر ڕێڕەوی چیرۆکەکە.

## ئاستی یەکەم: لابردنی وشەی "قال" و دانانی وشەیەکی دیکە:

١ـ هەندێکجار وشەی "قـال" لابـراوە و لـە جیاتیـدا وشـەیەکی دیکـە دانراوە کە جێی ئەوی گرتووەتەوە، لەوانـە: بـەکارهێنانی وشـەی (أن) کە تایبەتە بە شیکردنەوە و لێکدانەوەی بابەتەکە. بۆ نموونـە: ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا لُقْمَنَ ٱلْحِكْمَةَ أَنِ ٱشْكُرْ لِلَّهِ ﴾، لێرەدا ئاماژەیە بۆ ئـەوەی کـە "ئێمـە حیکمەت و داناییمان بەخشی بە لوقمان کـە: سـوپاس و ستایشـی خـوا بکە"، لێرەدا لە جیاتی ئەوەی بفەرموێت: داناییمان بەخشی بە لوقمان،

پێمـانوت: سوپاسـی خـوا بکـە، وشـەی "پێمـانوت: قلنـا" لابـراوە و لەجیاتیدا وشەی "أن" بەکارهێنراوە کە جێی "قلنا"ی گرتووەتەوە.

ئەوەی جێی سـەرنجە، هـەر کاتێـك وشـەی "أن" بـەکارهاتبێت، لـە دوایەوە شتێك هاتووە کە زیـاتر وەسـفی جوڵـە و بـزاوت و ئامـاژە یـان کارکردن بە هاوتەریبی کردارەکـە، دەکـات. بـۆ نموونـە: ﴿ وَهُمْ يَتَخَافَتُونَ ﴿٢٣﴾ أَن لَّا يَدْخُلَنَّهَا ٱلْيَوْمَ عَلَيْكُم مِّسْكِينٌ ﴿٢٤﴾ ﴾، واتـە: (بە چپەقسـەیان دەکـرد و دەیـانوت: نابێـت ئـەمڕۆ هـەژاران ڕوو بکەنـە باخەکـەمان).. ئـەم بـە چپەقسەکردنە، عادەتەن ئامـاژەکردن بـە دەسـتی تێدایـە.. ﴿ فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوْمِهِۦ مِنَ ٱلْمِحْرَابِ فَأَوْحَىٰٓ إِلَيْهِمْ أَن سَبِّحُوا۟ بُكْرَةً وَعَشِيًّا ﴾ واتـــــە: (لـــــە میحرابەکـە هاتــەدەرەوە بـۆ نـاو گەلەکـەی کـە: بـەیانیان و ئێـواران تەسبیحاتی خوا بکەن). دیارە ئەم (أن)ـە کە لـە جیـاتی "...بۆ نـاو گەلەکەی و پێیوتن تەسبیحاتی خوا بکەن..."، واتـە لـەجیاتی "قـال" بـەکارهاتووە، وەسـفی ئامـاژەپێـدانی تێدایـە، واتـە کـە زەکـەریا لـە میحرابەکە هاتە دەرەوە، زمانی لەگۆ کەوتبوو، بە ئاماژە بـە گەلەکـەی وت: بەیانیان و ئێواران تەسبیحاتی خوا بکەن.

نموونەیـــەکی دیکـــە، ﴿ وَأَوْحَىٰ رَبُّكَ إِلَى ٱلنَّحْلِ أَنِ ٱتَّخِذِى مِنَ ٱلْجِبَالِ بُيُوتًا ﴾، واتە: (پەروەردگارت نیگای نارد بۆ هەنگ کە: لە چیاکان مـاڵ دروسـت بکـە)... بەهەمانشـێوە لـەجیاتی "قـال"، "أن" بـەکارهاتووە، واتـە لەجیاتی "...نیگای نارد بۆ هەنگ پێی فەرموو: لە چیاکان ماڵ دروست

بکە"، بەشێوەی (أن) "کە" هێناویەتی.. ئەمەش بەهەمانشێوە دیارە کە ئاماژە و ڕێنیشاندانی تێدایە..

ئەوەی جێی تێبینییە ئەوەی لەم شوێنانەدا بە "أن" دەردەبڕدرێت و مانای تەواوەتی دەگەیەنێت، بە وشەی "قال" ئەو مانایە نابەخشێت، هەر لەبەر ئەوەشە "قال" لابراوە.

٢ـ هەندێکجار کە وشەی "قال" لابراوە، لە جیاتیدا وشەیەکی دیکە بەکارهاتووە کە مانایەکی هاوشێوە بگەیەنێت، بۆ نموونە فرمانی "نادی: بانگی کرد"، بۆ نموونە: ﴿وَنَادَىٰ نُوحٌ ٱبۡنَهُۥ وَكَانَ فِي مَعۡزِلٖ يَٰبُنَيَّ ٱرۡكَب مَّعَنَا﴾، ﴿وَزَكَرِيَّآ إِذۡ نَادَىٰ رَبَّهُۥ رَبِّ لَا تَذَرۡنِي فَرۡدٗا وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلۡوَٰرِثِينَ﴾. کە لەجیاتی "ونادی نوح ابنه قال یا بني..."، "نادی ربه قال: رب..." بەکارهاتووە.. لەکاتێکدا لە شوێنی دیکەدا کە هەمان فرمانی "نادی" بەکارهاتووە، بە دوایدا "قال"ی بەکارهێناوە، بۆ نموونە: ﴿وَنَادَىٰ نُوحٞ رَّبَّهُۥ فَقَالَ رَبِّ إِنَّ ٱبۡنِي مِنۡ أَهۡلِي﴾، ﴿وَنَادَىٰ فِرۡعَوۡنُ فِي قَوۡمِهِۦ قَالَ يَٰقَوۡمِ أَلَيۡسَ لِي مُلۡكُ مِصۡرَ﴾. بۆچی؟ لەبەرئەوەی لە دوایەوە پاڕانەوە نەهاتووە، بەڵکو "ڕستەی هەواڵی" "جملة خبرية" هاتووە..

٣ـ هەندێك جاری دیکە لابردنی "قال" قەرەبوو کراوەتەوە بە شتێکی دیکەی پێشبینی نەکراو، بۆ نموونە: هاتنی دەنگێکی پێشبینی نەکراو لە گۆڕەپانی نمایشکردنی دیمەنەکەدا یان لە هەموو وتووێژەکەدا

و گۆڕینیەتی بۆ دیمەنێکی جیاوازتر لەوەی کە گوێگر لە سەرەتاوە پێشبینی دەکرد. ئەمە لە چیرۆکەکەی مووسا (سەلامی خوای لێبێت) دەردەکەوێت کاتێك چوو بۆ هەواڵزانینی ئەو ئاگرەی بینیبووی، بەڵام لەوێ کتوپڕ دەنگێك بانگی دەکات ئەی مووسا من پەروەردگاری تۆم، نەعلەکانت دابکەنە ئێرە خاکی پیرۆزە...

هەروەها لە دیمەنی زەکەریا (سەلامی خوای لێبێت) هەمان شت دەبینین، بە دڵ دیقەت بدە خوێنەری بەڕێز! زەکەریا بە تەنها لە میحرابەکەیدا دانیشتووە، پیر بووە و نەخۆشییەکانی پیریی و نیشانەکانی، دیاری داوە لە ڕووی و لە هێز و توانایدا، نزا دەکات، دەپاڕێتەوە لە پەروەردگاری تا منەت و نیعمەتی خۆی بڕێژێت بە سەریدا و منداڵێکی پێببەخشێت، ئەمە لەکاتێکدا پیر بووە و ژنەکەیشی پیر بووە و توانای منداڵبوونی نەماوە و ئێسکیان لاواز بووە. ئەمە هەمووی بێئومێدییەکی زۆری تووشی زەکەریا کردووە، بەڵام یەك ڕاستیی گەورە هەیە، کە پێشتر مەریەمی خواناس خستوویەتییە بیری زەکەریا: خوا ڕۆزی هەر کەسێك بیەوێت، دەیدا بەبێ ژمارە و حساب.. هەر بە هۆی ئەم وتەیەشەوە بووە زەکەریا بە تەنها و لەو ساتە هێمن و بێدەنگەدا لە میحرابەکەیدا هەڵکورماوە و دەستە و نەزەر بە بێدەنگیی "خفیا" خەریکی نزاکردنە، تا خوا سۆزی خۆی بەسەردا بڕێژێت، هەرچەندە دەزانێت نە خۆی و نە ژنەکەی، کەڵکی منداڵبوونیان نەماوە لە ڕووی هێز و تواناوە... ئا لەو ساتەوەختە بێدەنگەی میحرابەکەی

زەکەریادا، دەنگێکی غەیبیی ئاسمانیی کتوپڕ بێدەنگیی دۆخەکە دەشڵەقێنێت: ﴿ يَٰزَكَرِيَّآ إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلَٰمٍ ٱسۡمُهُۥ يَحۡيَىٰ لَمۡ نَجۡعَل لَّهُۥ مِن قَبۡلُ سَمِيّٗا ﴿٧﴾ ﴾، واتە: (ئەی زەکەریا! ئێمە مژدەی منداڵێکت پێدەدەین ناوی یەحیایە...)، ئای لەو دەنگە ئاسمانییە کتوپڕە مژدەدەرە، لەو سکونەتەی ناو میحرابدا چۆن دەبێتە هۆی سەرلەبەر گۆڕینی ژیانی زەکەریا و پەتی ئومێدی پاش پچڕانی، پێکدەبەستێتەوە و بەوەش سەرلەنوێ ژیانێکی نوێ بۆ زەکەریا و یەحیا و بەدوایدا مریەم و عیسا (سەلامی خوایان لێبێت) دەستپێدەکات...

٤ـ هەندێکجار لابردنی وشەی "قال"، بە هۆی گۆڕینی ئاڕاستەی قسەیە لە بەرانبەر مرۆڤەکان، بەرەو ئاڕاستەکردنی بەرانبەر بە پەروەردگار.. سەیری ئەم نموونانە بکە:

﴿ وَمَا تَنقِمُ مِنَّآ إِلَّآ أَنۡ ءَامَنَّا بِـَٔايَٰتِ رَبِّنَا لَمَّا جَآءَتۡنَاۚ رَبَّنَآ أَفۡرِغۡ عَلَيۡنَا صَبۡرٗا وَتَوَفَّنَا مُسۡلِمِينَ ﴾، سەرەتای ئایەتەکە قسەی جادووگەرەکانی فیرعەونە پاش باوەڕهێنانیان، کە ڕووەو فیرعەون قسە دەکەن، پاشان کتوپڕ ئاڕاستەی قسەکان دەگۆڕێت بەرەو پەروەردگار و لەو دەپاڕێنەوە..

﴿ إِلَّا قَوۡلَ إِبۡرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ لَأَسۡتَغۡفِرَنَّ لَكَ وَمَآ أَمۡلِكُ لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن شَيۡءٖۖ رَّبَّنَا عَلَيۡكَ تَوَكَّلۡنَا وَإِلَيۡكَ أَنَبۡنَا وَإِلَيۡكَ ٱلۡمَصِيرُ ﴿٤﴾ ﴾، سەرەتای قسەکە ئیبراهیم لەگەڵ باوکیدا دەدوێت، بەڵام کتوپڕ ئاڕاستەی قسەکە ڕووەو پەروەردگار دەبێت و دەبێتە نزا و پاڕانەوە. ﴿ وَقَالَ إِنِّي ذَاهِبٌ إِلَىٰ رَبِّي سَيَهۡدِينِ ﴿٩٩﴾ رَبِّ

﴿ هَبۡ لِي مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ١٠٠ فَبَشَّرۡنَٰهُ بِغُلَٰمٍ حَلِيمٖ ١٠١ ﴾. سەرەتای قسەکان ڕووە و هۆزەکەیەتی، پاشان ڕوو دەکاتە پەروەردگار.. ئەمە هەمووی بەبێ دانانی وشەی "قال"، تا زیاتر دیمەنەکە بێنێتە بەرچاوی گوێگر. وەك بڵێی خوای گەورە دەیەوێت جەخت لەوە بکاتەوە کە ئەو، هەمیشە لەگەڵ بەندەکانیدایە و هەمیشە ئامادەیە لە هەر وتووێژ و دیمەنێکیاندا...

ئەوەی کە جێی سەرنجە، ئەوەیە ئەم جۆرەی لابردنی وشەی "قال"، زیاتر تایبەتە بە هاتنی نزا و پاڕانەوە بە دوایدا. لەبەرئەوەی دیقەتی ئەوە دەدەین نووح (سەلامی خوای لێبێت) لەکاتێکدا قسە لەگەڵ هۆزەکەی دەکات، ئاڕاستەی قسەکە دەکاتە پەروەردگار، بەڵام لەبەرئەوەی "نزا و پاڕانەوە" نییە، وشەی "قال" لانەبراوە، بەڵکو باسکراوە... تا ببێتە نێوانێك لە نێوان قسەکانی نووح بۆ گەلەکەی، لەگەڵ قسەکردنیدا بەرانبەر بە خوای گەورە کە سکاڵای خۆی دەباتە بەر قاپیی پەروەردگار لە دەست گەلەکەی، لەبەر ئەوە دووجار وشەی "قال"ی هێناوە لە نێوان قسەکەی لەگەڵ گەلەکەی و لەگەڵ پەروەردگاردا. ﴿ قَالَ يَٰقَوۡمِ إِنِّي لَكُمۡ نَذِيرٞ مُّبِينٌ ٢ أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱتَّقُوهُ وَأَطِيعُونِ ٣ يَغۡفِرۡ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمۡ وَيُؤَخِّرۡكُمۡ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمًّىۚ إِنَّ أَجَلَ ٱللَّهِ إِذَا جَآءَ لَا يُؤَخَّرُۚ لَوۡ كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ٤ قَالَ رَبِّ إِنِّي دَعَوۡتُ قَوۡمِي لَيۡلٗا وَنَهَارٗا ﴾.. سەیری ئایەتی کۆتایی بکەن: (قال رب انی دعوت قومی لیلا ونهارا).. کە لێرەدا

ئاراستەی قسەکە گۆڕدراوە، بەڵام لەبەر ئەوەی نزا و پاڕانەوە نییە، وشەی "قال" لانەبراوە.

نەك هەر ئەمە، ئەوەی جێی تێبینییە دەبینین سوورەتی نووح، تایبەتمەندییەکی دیکەی هەیە، ئەویش ئەوەیە کە نووح (سەلامی خوای لێبێت) قسەکان دەگێڕێتەوە و خۆی باسوخواسی خۆی و گەلەکەی باس دەکات. تەنها چوار وشەی تێدایە کە فەرموودەی پەروەردگار بێت لەو سوورەتەدا لەسەر شێوەی گێڕانەوە. ئەویش لە دوای ئایەتی یەکەم: ﴿إِنَّآ أَرۡسَلۡنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوۡمِهِۦٓ أَنۡ أَنذِرۡ قَوۡمَكَ مِن قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ۝١ قَالَ..﴾ پاشان ئایەتی پێنجەم، دواتر ئایەتی بیست و یەکەم ﴿قَالَ نُوحٞ﴾، لەگەڵ ئایەتی بیست و شەشەم: ﴿وَقَالَ نُوحٞ﴾.. ئیتر سوورەتەکە هەمووی کە ٢٨ ئایەتە، قسە و گوفتاری نووحە (سەلامی خوای لێبێت).

بەڵام بۆچی لەو شوێنانەدا وشەی "قال" بەکارهاتوون؟ بێگومان بۆ هەریەکەیان هۆکاری خۆی هەیە لە رووی تەکنیکی چیرۆك و گێڕانەوەوە. لە ئایەتی دووەمدا ئەوە ناساندنی قسەکەرە کە نووحە (سەلامی خوای لێبێت). لە ئایەتی پێنجەمدا بریتییە لە گواستنەوەی "گێڕانەوەی راستەوخۆ" بۆ "گێڕانەوەی رووداوی پێشتر/ فیدباك". لە ئایەتی بیست و یەکدا گواستنەوە لە "فیدباکەوە بۆ سکاڵاکردن بە شێوازی گێڕانەوەی راستەوخۆ". لە ئایەتی بیست و شەشیش

جیاکردنـەوە "فصـل" و پچـڕان بـە هێنـانی هـەواڵێکی نـوێ: خنکـانی گەلەکەی نووح، وایکردووە وشەی "قال" باس بکرێت.

بە ڕاسـتی ئـەم سـوورەتە موبارەکـە، تـا لەسـەری بـدوێین لـە رووی تەکنیکی چیرۆکەوە، هێشـتا مـافی تـەواوەتی خـۆی پێنـادەین. لێـرەدا تایبەتمەندییـەکی دیکـەی ئـەم گێڕانەوەیـە لـە سـوورەتی نووحـدا دەردەکـەوێت، کـە لەسـەر زمـانی نـووح دەگێڕدرێتـەوە، ئـەویش بـەکارهێنانی شـێوازی "گەڕانـەوە بـۆ رووداوەکـان" کـە پێیـدەوترێت "فیدباك"، واتە پچڕینی گێڕانەوەکە تا رووداوێکی پێشتر بـاس بکـەین، بە هەموو وردەکارییەکانییەوە تـا تـەواو دەبێـت، پاشـان گەڕانـەوە بـۆ تەواوکردنی باسە سەرەکییەکە و رووکردنە پەروەردگار بـە سـکاڵاکردن لەدەسـت گەلەکـەی و گێڕانـەوەی چـەند کـارێکی هەڵـە و تاوانیـان کـە شایستەی سزای خوایان دەکات.. ئنجا لەوێدا فەرموودەی پـەروەردگار دێتە پێشەوە و نووح و گوێگرانیش ئاگادار دەکاتەوە لـە سـزاکەیان بـە هـۆی ئـەو تاوانانـەوە: ﴿مِّمَّا خَطِيٓـَٔـٰتِهِمۡ أُغۡرِقُواْ فَأُدۡخِلُواْ نَارٗا فَلَمۡ يَجِدُواْ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ أَنصَارٗا﴾، واتە: (بە هـۆی تاوانەکانیانـەوە خنکێنـران و خرانـە ئاگرەوە و هیچ پشت و پەنایەکیشـیان نـەبوو).. بـە دوایـدا پاشمـاوەی قسـەکانی نـووح دەسـتپێدەکاتەوە، کـە بـە وشـەی "وقـال نـووح" دەسـتپێدەکات و دوو نـزا لـەخۆ دەگرێـت، یـەکیان تایبەتـە بـە ڕیشەکێشکردنی شوێنەوار و بنەچـەی بێبـاوەڕان، کـە وشـەی "قـال"ی تێدایە، دووەمیشیان بـە نزاکـردن بـۆ دایـك و بـاوکی و ئیمانـداران، کـە

وشەی "قال"ی تیادا لابراوە.. لەبەرئەوەی ڕێکخستنی سیاقی بابەتەکە وایکردووە ئەم نزایەش هەر لە دوای نزای یەکەمەوە بێت و پێویستیی بە وشەی "قال" نەبێت. (تێبینی: وەك لەوەوبەر باسمانکرد، لێرەشدا دەبینین لە دوای خنکانیان لەناو ئاودا، یەکسەر سەرەنجامیان باسدەکات کە دەخرێنە دۆزەخەوە، ئەمەش بازدانە بەسەر ئەو زەمەنەدا کە خنکاون و مردوون تا ئەو کاتەی کە قیامەت هاتووە و زیندوو کراونەتەوە و دادگایی کراون و بڕیاری چوونە ناو دۆزەخیان بەسەردا دراوە).

## ئاستی دووەم: چەندجار لابردنی وشەی "قال":

ئاستێکی دیکە بریتییە لە لابردنی وشەی "قال" دوو جار یان زیاتر، لە یەك وتووێژ و دیالۆگدا، کە کاتێك وتووێژەکە دەخوێنیتەوە وا هەست دەکەیت گێڕەرەوە "راوی" دەستبەرداری کەسایەتییەکانی ناو وتووێژەکە بووە و بە تەنها بەجێیهێشتوون تا خۆیان قسەکان بکەن و ڕووداوەکان بڕۆن ـ ئەمە بۆ چیرۆکی ئاسایی ـ. جا سەیری ئەم وتووێژە بکەن: ﴿وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلْمُجْرِمُونَ نَاكِسُوا۟ رُءُوسِهِمْ عِندَ رَبِّهِمْ رَبَّنَآ أَبْصَرْنَا وَسَمِعْنَا فَٱرْجِعْنَا نَعْمَلْ صَٰلِحًا إِنَّا مُوقِنُونَ ﴿١٢﴾ وَلَوْ شِئْنَا لَءَاتَيْنَا كُلَّ نَفْسٍ هُدَىٰهَا وَلَٰكِنْ حَقَّ ٱلْقَوْلُ مِنِّى لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴿١٣﴾ فَذُوقُوا۟ بِمَا نَسِيتُمْ لِقَآءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَآ إِنَّا نَسِينَٰكُمْ ۖ وَذُوقُوا۟ عَذَابَ

ٱلۡخُلۡدِ بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴾.. واته: (ئەگەر تاوانباران و گوناهکاران ببینی کە لە پێشگای پەروەردگاریان سەریان شۆڕکردووەتەوە: پەروەردگارا! دیتمان (ئەوەی خۆمان لێ کوێر کردبوو) و بیستمان (ئەوەی خۆمان لێ کەڕ کردبوو. ئێستا پەشیمانین و) تەواو باوەڕمان پەیداکردووە و ئیمانمان هێناوە، جا بمانگێڕەوە (سەر دونیا) تا کاری باش و چاك بکەین. ئەگەر حەزمان بکردبایە و ویستبامان هەرکەسمان هیدایەت دەدا، بەڵام وەعدە و بەڵێنی من حەتمی و قەتعییە، جەهەننەم لە جنۆکە و بنیادەم تێکڕا و پێکڕا پڕ دەکەم. دە بچێژن بە هۆی ئەوەی کە لە بیرتان چوو فەرامۆشتان کرد کە ئەو ڕۆژە دەبینن و دیداری دەکەن. ئێمەش ئێوە (لەنێو عەزابدا) لەبیر دەبەینەوە و فەرامۆشتان دەکەین. دە جا عەزابی هەتا هەتایی بچێژن بە هۆی ئەو کارانەی (لە دونیادا) دەتانکرد).

دیمەنەکە باسی هەڵوێستی بێباوەڕان دەکات کاتێك لەبەردەستی پەروەردگاردان لە ڕۆژی دواییدا، وتووێژەکە بە پۆزشهێنانەوەی بێباوەڕەکان دەستپێدەکات بۆ پەروەردگار: (بەبێ وشەی: وتیان): پەروەردگارمان بینیمان و بیستمان، بمانگێڕەوە بۆ دونیا کاری چاك دەکەین...، وەڵامی پەروەردگاریان بۆ دێتەوە: (دیسان بەبێ وشەی: وتی): ئەگەر بمانویستایە هیدایەتی هەموو کەسێکمان دەدا...، پاشان فەرمانی خوایی دەردەچێت بۆیان: (جارێکی دیکە بەبێ وشەی: وتی): بچێژن بەرانبەر بە لەبیرکردنی ئەم ڕۆژەتان.....

دیقەت دەدەین، سێ جار وشەی "قال" و موشتەقاتەکانی لابراوە و وتووێژەکان خۆیان دەدوێن و رووداوەکان دەخەنەڕوو.

سەیری ئەم نموونەیەی دیکە بکەن: ﴿ وَهُمۡ يَصۡطَرِخُونَ فِيهَا رَبَّنَآ أَخۡرِجۡنَا نَعۡمَلۡ صَٰلِحًا غَيۡرَ ٱلَّذِي كُنَّا نَعۡمَلُۚ أَوَلَمۡ نُعَمِّرۡكُم مَّا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَن تَذَكَّرَ وَجَآءَكُمُ ٱلنَّذِيرُۖ فَذُوقُواْ فَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِن نَّصِيرٍ ﴾، بە کورتی: دیقەت دەدەین سێ جار وشەی "قال" لابراوە، لە سەرەتادا پێش "ربنا أخرجنا..."، لەپێش: "أولم نعمركم..."، هەروەها لەپێش دەرچوونی فەرمانی ئیلاهی: (فَذُوقُواْ) واتە بچێژن..... هەروەها لە چەندین شوێنی دیکەشدا.

هەموو ئەمانە لەبەرئەوە وشەی "قال" لابراوە، تا گوێگر ڕاستەوخۆ بخاتە ناو دیمەنە زیندووەکەوە وەك بڵێی خۆمان ڕاستەوخۆ لە زاری قسەکەرەکانەوە وتووێژەکە دەبیستین بە بێئەوەی قسەگێڕەرەوە "راوی" دەستوەربداتە وتووێژەکەوە. لە هەموو ئەو دیمەنانە پڕ هەیبەتتر، ئەم دیمەنە غەیبییەیە: ﴿ يَوۡمَ هُم بَٰرِزُونَۖ لَا يَخۡفَىٰ عَلَى ٱللَّهِ مِنۡهُمۡ شَيۡءٞۚ لِّمَنِ ٱلۡمُلۡكُ ٱلۡيَوۡمَۖ لِلَّهِ ٱلۡوَٰحِدِ ٱلۡقَهَّارِ ﴿١٦﴾ ﴾، واتە: (ڕۆژی ڕووبەڕووبوون، ڕۆژێکە کە خەڵك نمایان و ئاشکرا دەبن. شتێکی ئەوان لە خودا ناشاردرێتەوە و ون نابێت: موڵك و مەملەکەت و فەرمانڕەوایی ئەوڕۆ هی کێیە؟ هی خودای تاك و تەنیای زاڵ و چیرەیە).

که موفەسسیرانی قورئان کۆدەنگ نین لەسەر ئەوەی کێ بەشی دووەمی ئایەتەکەی وتووە، کێ وتوویەتی: ئەمڕۆ موڵك و دەسەلات بۆ کێیە؟ بەڵام هەرچۆن بێت ئەمە دیمەنێکی پڕ هەیبەتە، کاتێك وەسفی ئەو جیاوازییە گەورەیە دەکات لە نێوان سیفاتەکانی پەروەردگار لە گەورەیی و بڵندیی و بەرزییدا لەو ڕۆژەدا، بە بەراورد بە سیفاتەکانی بەندەکانی لەسەرشۆڕیی و ملکەچبوونیان لەو ڕۆژەدا بۆ پەروەردگاریان. ئەوەی کە یارمەتیی خستنەڕووی ئەم دیمەنە گەورەیە دەدات، لە تەنیشت یەکبوونی قسەکانە و بەدوای یەکدا هاتنیانە، کە وەك تیرێك ڕاستەوخۆ ئامانجەکەی پێکاوە لە دڵ و عەقڵی گوێگراندا. لەم دیمەنەدا گێڕانەوە و وەسف و وشەی "قال" تیایدا لابراوە و تەنها و تەنها دیمەنەکە خۆی لە گۆڕەپانەکەدا ماوەتەوە، کە بە باشترین شێوە گوزارشتی لە بارودۆخەکە کردووە.

## ئاستی سێیەم: دووبارەکردنەوەی وشەی "قال":

بەشێکی دیکەی هاوپەیوەند بەم بابەتە، بریتییە لە دووبارەکردنەوەی وشەی "قال"، کە پێشتریش هەندێك ئاماژەمان بۆ کرد. با سەیری ئەم نموونەیەی باسوخواسی شاژنە بەلقیس بکەین، کاتێك سولەیمان (سەلامی خوای لێبێت) نامەیەك بە هودهوددا دەنێرێت بۆ شاژنی سەبەء، هودهود نامەکە فڕێ دەداتە کۆشکەوە، شاژن نامەکە دەبینێت، دەستوپێوەند و پیاوماقوڵان کۆدەکاتەوە و نامەکەیان بۆ

دەخوێنێتەوە، پاشان گفتوگۆ و مقۆمقۆ دروست دەبێت لە ناو ئامادەبوواندا کە چۆن وەڵامی سولەیمان بدەنەوە:

﴿ قَالَتْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَؤُا۟ إِنِّىٓ أُلْقِىَ إِلَىَّ كِتَٰبٌ كَرِيمٌ ﴿٢٩﴾ إِنَّهُۥ مِن سُلَيْمَٰنَ وَإِنَّهُۥ بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٣٠﴾ أَلَّا تَعْلُوا۟ عَلَىَّ وَأْتُونِى مُسْلِمِينَ ﴿٣١﴾ قَالَتْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَؤُا۟ أَفْتُونِى فِىٓ أَمْرِى مَا كُنتُ قَاطِعَةً أَمْرًا حَتَّىٰ تَشْهَدُونِ ﴿٣٢﴾ قَالُوا۟ نَحْنُ أُو۟لُوا۟ قُوَّةٍ وَأُو۟لُوا۟ بَأْسٍ شَدِيدٍ وَٱلْأَمْرُ إِلَيْكِ فَٱنظُرِى مَاذَا تَأْمُرِينَ ﴿٣٣﴾ قَالَتْ إِنَّ ٱلْمُلُوكَ إِذَا دَخَلُوا۟ قَرْيَةً أَفْسَدُوهَا وَجَعَلُوٓا۟ أَعِزَّةَ أَهْلِهَآ أَذِلَّةً ۖ وَكَذَٰلِكَ يَفْعَلُونَ ﴾.

سەرەتا نووسراوەکەی سولەیمان (سەلامی خوای لێبێت) دەگاتە شاژن، دەیخوێنێتەوە بۆ پیاوانی کۆشك و سیاسەتمەدار و ئەفسەرە پلە بەرزەکانی وڵات: (قالت یا أیها الملا إنی ألقی إلی کتاب کریم....). لێرەدا وشەی "قالت" بەکارهاتووە: "شاژن وتی: پیاوماقوڵان! نووسراوێکی بەڕێزم بۆ هاتووە لە سولەیمانەوە و بە ناوی خوا دەستپێدەکات کە مسوڵمان ببن.. شاژن وتی: ئەی پیاوماقوڵان پێمبڵێن چی بکەین....". دیقەت بدەن دووبارە فەرموویەتی: "شاژن وتی" "قالت".. چی پێویستی دەکرد دووبارە وشەی "قالت" باس بکرێت لەکاتێکدا قسەکەر هەر شاژن خۆیەتی؟. کاتێك ورد دەبینەوە دەبینین ئەم دووبارەکردنەوەیەی وشەی "قالت"، ئاماژەیە بۆ ئەوەی کاتێك شاژن نامەکەی خوێندووەتەوە بۆ پیاوماقوڵان، هەر ئەوەندەی دەستوپێوەند گوێبیستی ئەو نامەیە بوون، بەتایبەتی کە وشەی

توونـدی تێـدا بـەکارهاتووە، دەسـتبەجێ دەسـتوپێوەند هەسـتاون و دەنگیـان بـەرز کردووەتـەوە و بـە ڕق و کینـەوە پرسـیاری ئـەوەیان کردووە: ئـەم سـولەیمانە کێیـە؟ ئـەی ئـەم نامەیـە چۆن گەیشـتووەتە ئێرە؟ ئەی کوا نامەهێنەرەکەی؟ ئەی وڵات و مەملەکەتەکەی دەکەوێتە کوێ؟ ئایا ئەوەنـدە بـە هێـزی خـۆی دەنازێـت کـە هێـرش بکاتـە سـەر شانشینەکەی ئێمە بەم شێوە خۆبەزلزانییە؟.. دەبێت ئێمە سـزای ئـەو بدەین، دەبێت تەمێی بکەین، دەبێت واو وای لێبکـەین.... هـەموو ئـەم قسە و هەڕەشە و بێزارییانە دەربڕان لەکاتێکدا شـاژن بێـدەنگ بـووە و چاوەڕێی تەواوبوونی قسەکانی ئەوانـە، کـە خۆیشـی دەزانێـت چـی لـە پشتەوەیە. خۆی، شاژنێکی دانا و دونیا دیدەیـە و شـارەزای کاروبـاری شانشینەکەی و خەڵکەکەیەتی. جا کاتێك دەستوپێوەند زانییـان شـاژن بێـدەنگ بـووە و چـاوەڕێیە ئـەوان تـەواو بـبن تـا قسـەی خـۆی بکـات، بێدەنگ بوون. پاشان شاژن سەرلەنوێ - پـاش ئـەو بگـرە و بەردەیـە - دەسـتدەکاتەوە بـە قسـە و "دەڵێـت: ئـەی پیاومـاقوڵان ڕای خۆتـانم پێبڵێن، من بەبێ بۆچوونی ئێوە هیچ فـەرمانێك دەرناکـەم"... کەواتـە پچڕانێك هەیـە لـە نێـوان قسـەی یەکـەمجار و دووەمجـاردا، لەبەرئـەوە دووبـارە وشـەی "قالـت" بـەکارهاتووە، هـەروەها دوای ئـەم داوایـەش دیسانەوە دەستوپێوەند دەکەونـەوە هـەڵا و هەڕەشـەکردن و سـزادانی هەر کەسێك کە بیەوێت دەستمان بۆ درێژ بکات و قبـوڵی ناکـەین لێـی! لێرەدا دیسانەوە شاژنی دانا بێدەنگیان دەکات و چەند ڕاستییەکیان لە

ڕوانگەی دونیا دیدەیی خۆیەوە بۆ باس دەکات و "دەڵێت: پاشاکان ئەگەر بدەن بەسەر هەر وڵاتێکدا کاولی دەکەن و گەورە و پیاوماقوڵانی دەکەنە ژێر دەستە و ملکەچ... با ئێمە کارێکی وەها نەکەین". دیقەت بدەن! پاش هەڕەشە و گوڕەشەی خەڵکەکە کە شاژن دەکەوێتەوە قسە، پێویست دەکات سەرلەنوێ وشەی "قالت" بەکاربێتەوە وەك ئاماژەیەك بۆ پچڕانی قسەکانی شاژن... جا دووبارەکردنەوەی وشەی "قالت" تەنها لە ڕووکاردا نییە، بەڵکو هەڵگری ئەو مانایەیە کە دیمەنێکی دیکە باسنەکراوە لە نێوانیاندا و سیاقی باسەکەش هیچ ئاماژەیەکی بۆ نەکردووە، تەنها بە هێشتنەوەی وشەی "قالت" ئاماژەی بۆ کردووە و ڕێنمایی گوێگر دەکات بۆ ئەو دیمەنە باسنەکراوانە، کە ئەگەر وشەکە لابرایە، ئەوا نەماندەزانی چی لە کۆشکی شاژن ڕوویداوە..

جا پێدەچێت، چیرۆك و بەسەرهاتی شاژن لەگەڵ سولەیماندا (سەلامی خوای لێبێت)، پڕ بێت لە ڕووداوی هاوشێوە، وەرن با بچینە کۆشکی سولەیمان بزانین لەوێ چ باسە... وا کورسیی شاژنێتیی (تەختی پاشایی – عەرش)ی بەلقیس لە چاوتروکانێکدا گەیشتووەتە بەردەستی سولەیمان، ئەمیش سوپاسی خوا دەکات لەسەر ئەو نیعمەتە و پاشان ئاڕاستەی قسە دەکاتە سەربازانی کە دەستکارییەکی کورسییەکە بکەن تا بزانین شاژن دەیناسێتەوە.. ﴿ فَلَمَّا رَءَاهُ مُسْتَقِرًّا عِندَهُۥ قَالَ هَٰذَا مِن فَضْلِ رَبِّى لِيَبْلُوَنِىٓ ءَأَشْكُرُ أَمْ أَكْفُرُ ۖ وَمَن شَكَرَ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِۦ ۖ

وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ رَبِّي غَنِيٌّ كَرِيمٌ ﴿٤٠﴾ قَالَ نَكِّرُوا لَهَا عَرْشَهَا نَنظُرْ أَتَهْتَدِي أَمْ تَكُونُ مِنَ الَّذِينَ لَا يَهْتَدُونَ ﴿٤١﴾ ﴾.. کاتێـك سـولەیمان کورسـییەکەی (عەرشـەکەی) بینی لای خـۆی، **وتـی:** ئەمـە لـە فـەزڵی خوایـە تـا تاقیمبکاتـەوە ئایـا سوپاسگوزار دەبم یان نا..... **وتی:** کورسییەکەی بۆ نەناس بکـەن، بـا ببینین ئایا دەیناسێتەوە....

لە سەرەتادا وشەی "قال" بەکارهاتووە، کە واتای ئەوەیە سولەیمان وتـی ئەمـە فـەزڵی خوایـە... بـە دوایـدا بەهەمانشـێوە وشـەی "قـال" بەکارهاتووەتەوە، کە واتای ئەوەیـە سـولەیمان وتـی کورسـییەکەی بـۆ نەناس بکەن... بۆچی؟ بۆ هاوشێوەی چیرۆکەکەی یوسف بەبێ وشەی "قال" بابەتەکەی بە کۆتا نەهێناوە کاتێك عـەزیزی میسـر وتـی: "ئـەم بەزمە لە فێڵی تۆیە ئەی زولەیخا، بەڕاستی فێڵی ئێوەی ژنان گەورەیە، ئەی یوسف! ئەمە باس مەکە و تۆش داوای لێخۆشـبوون بکـە – ئـەی زولەیخا –....". لێرەدا لە دوای قسەکەی عەزیز بەرانبەر بـە زولـەیخا، خوای گەورە نافەرموێت "قال": وەك بڵێی "**ئەنجا وتی:** ئەی یوسـف! ئەمـــە بـــاس مەکـــە"... ﴿ فَلَمَّا رَءَا قَمِيصَهُۥ قُدَّ مِن دُبُرٍ قَالَ إِنَّهُۥ مِن كَيْدِكُنَّ إِنَّ كَيْدَكُنَّ عَظِيمٌ ﴿٢٨﴾ يُوسُفُ أَعْرِضْ عَنْ هَٰذَا وَاسْتَغْفِرِي لِذَنۢبِكِ إِنَّكِ كُنتِ مِنَ الْخَاطِـِٔينَ ﴾. بۆچـی لەمـەی سـولەیمان‌دا ئـەوە ڕووی نەداوە؟

لەڕاستیدا دووبارەکردنەوەی وشەی "قال" لە چیرۆکەکەی سولەیماندا، بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە گەیشتنی کورسییەکەی شاژن و ئامادەکردنی لەبەردەم سولەیماندا بەو خێراییە ـ لە چاوتروکانێکدا ـ، بوو بە هۆی دروستکردنی موفاجەئە و حاڵەتێکی کتوپڕیی بۆ سولەیمان، کە سەرلەبەری گیانی هێنایە لەرزین، لەبەرئەوەی ئەم کارە خۆی لە خۆیدا پەرچوو "موعجیزە"یەکی گەورەیە، کە لە سەرووی هەموو پێشبینی و هەموو توانایەکی مرۆڤەوەیە، جا لەبەر ئەوە سولەیمان هەستی بە فەزڵی گەورەی پەروەردگار کرد بەسەرییەوە، ئەم رووداوە کتوپڕە بۆ ماوەیەك بێدەنگی کرد، کز بوو، سەرسام بوو، جا کاتێك کە قسەی یەکەمی تەواو کرد: "سولەیمان وتی: ئەمە لە فەزڵی خوایە تا تاقیمبکاتەوە..."، پاشان سولەیمان ماوەیەك بێدەنگ بوو، خامۆشیی رووی تێکرد، بیری کردەوە لەم فەزڵە گەورەیە، لەم موعجیزەیە، ئای خوای گەورە چ گەورەیی و توانا و دەسەڵاتێکی نیشان داوە...! پاشان سولەیمان بیری هاتەوە بە لای خۆیدا و سەیری دەورروبەری کرد و هاتەوە باری ئاسایی و ڕوویکردە ئەوانەی دەورروبەری و "وتی: کورسییەکەی بۆ نەناس بکەن، بزانین دەیناسێتەوە یان نا"... کەواتە قسەی یەکەمی کە وتی ئەمە فەزڵی خوایە، زیاتر لە قسەی ناو دڵی خۆی دەچێت، جا چ بە نهێنیی وتبێتی یان بە ئاشکرا، بەڵام ئەم قسەیەیان فەرماندانە بەسەر دەورروبەرەکەیدا کە کارێك بکەن. ئەمە گواستنەوەیە لە "نهێنییەوە یان لە قسەی ناودڵی خۆت"، بۆ

"ئاشكراكردن يان قسەی سەر زار"، بەڵام پاش تێپەڕبوونی كات.. جا بوونی وشەی "قال"ی دووەم بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كەمێكی پێچووە تا قسەی دووەم كراوە و پاشانیش گۆڕانێك لە ئاڕاستەی قسەكاندا ڕوویداوە بۆ دەستوپێوەندەكەی.

ئەمە هەمووی، بە پێچەوانەی قسەكەی عەزیزی میسرەوەیە، كە بە زوڵەیخا دەڵێت ئەمە فێڵی تۆیە و، دەستبەجێ، هەر بە خێرایی، بێئەوەی كاتی پێبچێت، ڕوودەكاتە یوسفیش: "ئەم باسە لای كەس مەدركێنە..."، كە خێرا لا دەكاتەوە بە لایەوە و فەرمانی پێدەدات بەخێرایی بەبێئەوەی چاوەڕێی ئەوە بكات كەس قسەی دیكە بكات: باسەكە دیزەبەدەرخۆنە بكات و نەیدركێنێت...

لێرەدا دوو نموونەی دیكە باس دەكەین، بەڵام شیكردنەوەی دەسپێرین بە خوێنەر، تا ئەویش بەشدار بێت لە شارەزابوون لەم جۆرە تەكنیكانەی گێڕانەوەی چیرۆكدا و خۆیشی وردبوونەوە لە قورئاندا بكات.. گەلەكەی مووسا داوا لە مووسای سەروەرمان دەكەن بتێكیان بۆ بهێنێت تا بیپەرستن، ئەویش بەمجۆرە وەڵامیان دەداتەوە: ﴿قَالَ إِنَّكُمْ قَوْمٌ تَجْهَلُونَ ﴿١٣٨﴾ إِنَّ هَٰؤُلَاءِ مُتَبَّرٌ مَا هُمْ فِيهِ وَبَاطِلٌ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿١٣٩﴾ قَالَ أَغَيْرَ اللَّهِ أَبْغِيكُمْ إِلَٰهًا وَهُوَ فَضَّلَكُمْ عَلَى الْعَالَمِينَ ﴿١٤٠﴾﴾.. لە سەرەتادا وشەی "قال" هاتووە، كە "مووسا وتی:....."، لە دواتریشدا دیسانەوە وشەی "قال" هاتووە... بۆچی؟ بێگومان لەو نێوانەدا حیوار

و وتووێژێك هەیە لە نێوان مووسا و گەلەكەیدا كە زیاتر قسەی نابـەجێی گەلە سەرلێشێواوەكەیە كە لەبەر نابەجێیی قسەكانیان، قورئـان نـەقڵی نەكردووە بۆمان، جا دووپاتكردنەوەی وشـەی "قـال"، ئاماژەیەكـە بـۆ بوونی ئەو قسە نادروستانەی گەلەكەی.

هـەروەها لـە بابـەتی وتوویـژێكی نێـوان پـەروەردگار لەگـەڵ ئـەهلی دۆزەخـــــــدا: ﴿ قَالُواْ رَبَّنَا غَلَبَتْ عَلَيْنَا شِقْوَتُنَا وَكُنَّا قَوْمًا ضَآلِّينَ ﴿١٠٦﴾ رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا مِنْهَا فَإِنْ عُدْنَا فَإِنَّا ظَٰلِمُونَ ﴿١٠٧﴾ قَالَ ٱخْسَـُٔواْ فِيهَا وَلَا تُكَلِّمُونِ ﴿١٠٨﴾ إِنَّهُۥ كَانَ فَرِيقٌ مِّنْ عِبَادِى يَقُولُونَ رَبَّنَآ ءَامَنَّا فَٱغْفِرْ لَنَا وَٱرْحَمْنَا وَأَنتَ خَيْرُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿١٠٩﴾ فَٱتَّخَذْتُمُوهُمْ سِخْرِيًّا حَتَّىٰٓ أَنسَوْكُمْ ذِكْرِى وَكُنتُم مِّنْهُمْ تَضْحَكُونَ ﴿١١٠﴾ إِنِّى جَزَيْتُهُمُ ٱلْيَوْمَ بِمَا صَبَرُوٓاْ أَنَّهُمْ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ ﴿١١١﴾ قَٰلَ كَمْ لَبِثْتُمْ فِى ٱلْأَرْضِ عَدَدَ سِنِينَ ﴿١١٢﴾ قَالُواْ لَبِثْنَا يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ فَسْـَٔلِ ٱلْعَآدِّينَ ﴿١١٣﴾ قَٰلَ إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا قَلِيلًا لَّوْ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿١١٤﴾ ﴾، ئـەهلی دۆزەخ دەڵـێن خوایـە دەرمانبێنـە لـە دۆزەخ... خـوای گـەورە دەفـەرموێت: بێـدەنگ بـن.... دواتـر هـەر فـەرموودەی پەروەردگار دێت، بەڵام لە ناوەڕاستدا وتووێژەكە دەپچڕێت و دیسانەوە وشـەی "قـال: كـم لبثـتم..."، "خـوا فـەرمووی: چـەندێك لەزەویـدا مانەوە..".. بۆچی دووبارە وشەی "قال" هاتووە لـە كاتێكدا قسـەكەر هەر یەك دانەیە و پەروەردگاری بەرز و بڵندە؟ بۆچی قسەكە پچڕاوە بە هێنـانی وشـەی "قـال"؟ بێگومـان ئـەو وشـەیە ئاماژەیـە بـۆ بـوونی

وەلامێکی نادروستانەی ئـەهلی دۆزەخ بەرانبـەر بـە پـەروەردگار، کـە کاتێك خوای گەورە باسی بەندە باشەکانی خۆی دەکات بۆیان، کە ئێوە گاڵتەتان پێدەکردن ئەوەتا ئێستا پاداشتم داونەتەوە بە بەهەشت، لـەو کاتەدا ئەوان قسەیەکی هەرچی و پەرچییانە دەکەن، بەڵام خوای گەورە بۆمان نقلّ ناکات لەبەر بێسەروبەرەیی و نامەنتیقیبوونی قسەکە، بەڵکو درێـژە بـە وتـەکانی خـۆی دەدات، بـەڵام وشـەی "قـال" لـەو نێوانـەدا دەهێنێت وەك ئاماژەیەك بۆ بوونی ئەو وتووێژە لابراوە...

## ئاستی چوارەم: لابردنی قسە وتراوەکە:

ئەم ئاستەیان تایبەتە بە لابردنی قسە وتراوەکە، واتە تەنها ئاماژەی پێکردووە و ئیتر قسەکەی باسنەکردووە، ئامـانجیش لێـی بـەهێزکردنی شێوازی "گێڕانەوە ـ السـرد"ی چـیرۆکەکەیە. لـەو بـارەوە دوو نموونـە دەهێنینەوە:

١. ﴿ فَٱصۡبِرۡ لِحُكۡمِ رَبِّكَ وَلَا تَكُن كَصَاحِبِ ٱلۡحُوتِ إِذۡ نَادَىٰ وَهُوَ مَكۡظُومٞ ﴾.

﴿ فَلَوۡلَآ أَنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلۡمُسَبِّحِينَ ﴿١٤٣﴾ لَلَبِثَ فِي بَطۡنِهِۦٓ إِلَىٰ يَوۡمِ يُبۡعَثُونَ ﴿١٤٤﴾ ﴾..

باســەکە، باســی یونســە (ســەلامی خــوای لێبێــت)، لــە یەکەمیانــدا دەفــەرموێت "ئــەی محەمــەد خۆڕاگربــە لــە بەرانبــەر فــەرمانی پەروەردگارتەوە، نەکەیت وەك هاوەڵی نەهەنگەکە بیت لەکاتێکدا دڵـی پـڕ بـوو بـە خەفـەت و پەژارەیـەکی زۆرەوە پاڕایـەوە"، ئـیتر لێـرەدا

نافەرموێت پاڕانەوەکەی چی بوو، واتە قسەکە کە پاڕانەوەکەیە لادەبات و تەنها بە وشەی "نَادَىٰ" ئاماژەی پێدەکات.. لە ئایەتی دووەمیشدا دەفەرموێت: "ئەگەر یونس لەو کەسانە نەبوایە کە تەسبیحات و یادی خوای دەکرد، ئەوا دەمایەوە لە سکی نەهەنگەکەدا تا ڕۆژێك کە هەمووان زیندوو دەکرێنەوە". دیسانەوە نەیفەرمووە تەسبیحات و یادکردنەکەی پەروەردگاری چی بووە و چی وتووە.. لەبەر ئەوەی لێرەدا زیاتر ڕەگەزی "گێڕانەوە ـ السرد" زاڵە بەسەر چیرۆکەکەدا و پێویست بە هێنانی قسەیەك ناکات لەو نێوانەدا. ئەمە لە لایەك، لە لایەکی دیکەوە لە شوێنی خۆیدا ئاماژەی بۆ ئەو نزا و پاڕانەوە و تەسبیحاتە کردووە، کە دەفەرموێت: ﴿ فَنَادَىٰ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ أَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ (الأنبياء: ٨٧) واتە: (یونس لە ناو تاریکایی دەریا و تاریکایی سکی نەهەنگەکە و تاریکایی شەودا هاواری کرد کە: هیچ پەرستراوێك نییە تەنها تۆ نەبێت، پاك و بێگەردیی بۆ تۆ، بە ڕاستی من لە ستەمکاران بووم).. ئەی بۆ لێرەدا قسەکەی یونس باسکراوە، لە وەڵامدا دەڵێین لێرەدا کە سوورەتی ئەنبیایە، باسی ئەو منەت و فەزڵانەی خوا کراوە بەسەر پێغەمبەرانی خۆیدا کە چۆن نزای یەکبەیەکیانی قبوڵ فەرمووە، هەروەها باسی دۆعا و پاڕانەوەی پێغەمبەرانی دیکەش کراوە کە نزایان کردووە و خوا لێی قبوڵ کردوون، پێویست بوو دەقی نزاکەی "یونس"یش (سەلامی خوای

لێبێـت) بـاس بکرێـت، کـه بـه دوایـدا خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ وَنَجَّيۡنَٰهُ مِنَ ٱلۡغَمِّۚ ﴾، وەڵاممـان دایـەوە و ڕزگارمـان کرد لەو ناڕەحەتییە.

٢ـ نموونەیەکی دیکەی هاوپەیوەند بە سەروەری مرۆڤایەتی (دروود ی خوای لێبێت)، خوای گەورە لە سوورەتی یونس ئایەتی (٦٥)دا پێی دەفـــەرموێت: ﴿ وَلَا يَحۡزُنكَ قَوۡلُهُمۡۘ إِنَّ ٱلۡعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًاۚ ﴾ واتـــە: قسەکەی ئەوان دڵتەنگت نەکات بەڕاستی عیـززەت و بـەرزیی و بڵنـدیی هەمووی هی خوایە. لێرەدا ئەوەی کە جێی ئاماژەیە ئەوەیە لە زانستی تەجوید و جوانخوێندنەوەی قورئانـدا پێویسـتە لەسـەر وشـەی (قـولهم) بوەستین و نابێت بە هیچ جۆرێك بە یەکەوە لەگەڵ (إن العزة لله جميعا) بیخوێنینەوە، لەبەرئەوەی ئەوکات ماناکەی ئـاوا دەردەچێت: "قسـەی ئەوان دڵتەنگت نەکات کە بەرزی و بڵندیی هـەمووی هـی خوایـە"، وەك بڵێی دەقی قسەکەی بێباوەڕان بریتیـی بێـت لـەوەی: بـەرزی و بڵنـدیی هەمووی هی خوایە، نەخێر، بەڵکو ئـەو قسـەیەی کـە ئـەوان کردوویانـە لێرەدا باسی نەکراوە، بەڵکو کە دەگەڕێینەوە بۆ سەرەتای سوورەتەکە ـ سوورەتی یونس ـ ئەو قسەیەی بێباوەڕان دەبینین کە چییان وتووە و قسەکەیان چی بووە، کە بووەتە هـۆی دڵتـەنگیی سـەروەرمان تـا خـوا پێیفەرمووە دڵتـەنگ مەبـە بـە قسـەکەیان.. ئـەوەتا لـە دووەم ئایـەتی سوورەتەکەدا ئاماژەی پێکـردووە و دەفـەرموێت: ﴿ أَكَانَ لِلنَّاسِ عَجَبًا

أَنْ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰ رَجُلٍ مِّنْهُمْ أَنْ أَنذِرِ ٱلنَّاسَ وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَنَّ لَهُمْ قَدَمَ صِدْقٍ عِندَ رَبِّهِمْۗ قَالَ ٱلْكَٰفِرُونَ إِنَّ هَٰذَا لَسَٰحِرٌ مُّبِينٌ ﴿٢﴾ ﴾: كەواتــە قســەكە ئەمــە بــووە كــە بــە ســەروەرمانیان وتــووە: (إِنَّ هَٰذَا لَسَٰحِرٌ مُّبِينٌ)، وتوویانە: بە ڕاستی ئەم پیاوە جادووگەرێكی دیار و ئاشكرایە، كـە ئـەم قسەیە هەمان ئەو قسەیەیە كە گەلی مووسا بە مووسایان وت و هەر لەم سوورەتی یونسەدا باسەكەی هاتووە: ﴿ فَلَمَّا جَآءَهُمُ ٱلْحَقُّ مِنْ عِندِنَا قَالُوٓاْ إِنَّ هَٰذَا لَسِحْرٌ مُّبِينٌ ﴾، كاتێك حەقیان لە لایەن ئێمەوە بۆ هات وتیـان: ئـەم حەقــە، جادوویــەكی دیــار و ئاشــكرایە. كەواتــە لێــرەدا دەبیــنین لێكچوونێك هەیە لە نێوان گەلی مووسا (سـەلامی خـوای لێبێـت) لەگـەڵ گــەلی محەممــەددا (درووود ی خــوای لێبێــت)، كــە هــەردووكیان بــە پێغەمبەرەكانیان دەڵێن ئەمانە جادووگەرن و ئەو حەقـەش كـە پێیانـە جادووە، بەڵام لە چیرۆكی مووسادا باسی سەرەنجامی گەلەكـە دەكـات كــە تیاچــوون و خنكانــە، وەك بفــەرموێت ســەرەنجامی گەلەكــەی محەممەدیش كە بە ڕاستیان نەزانی، تیاچوونە، وەك دواتـر لـە جـەنگی بەدردا ڕوویدا..

## ئاستی پێنجەم: بەکارهێنانی وشەکە بە شێوەی بکەر نادیار:

ئەم ئاستەیان بریتییە لەوەی کە وشەی "قال" بەکارهاتووە، بەڵام بە شێوەی بکەر نادیار، واتە "**قیل** ـ وترا"، ئەمەش زۆرتر لە دیمەنە غەیبییەکاندا بەدیدەکرێت، پێشتریش لە چەند شوێنێکی ئەم کتێبەدا ئاماژەمان بۆ کردووە، بۆ نموونە:

﴿ ثُمَّ قِيلَ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلْخُلْدِ هَلْ تُجْزَوْنَ إِلَّا بِمَا كُنتُمْ تَكْسِبُونَ ﴾

﴿ قِيلَ ٱدْخُلِ ٱلْجَنَّةَ ۖ قَالَ يَٰلَيْتَ قَوْمِى يَعْلَمُونَ ﴾

﴿ قِيلَ ٱدْخُلُوٓا۟ أَبْوَٰبَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۖ فَبِئْسَ مَثْوَى ٱلْمُتَكَبِّرِينَ ﴾

﴿ قِيلَ ٱرْجِعُوا۟ وَرَآءَكُمْ فَٱلْتَمِسُوا۟ نُورًا ﴾... هەروەها چەندین شوێنی دیکەی قورئانی پیرۆز..

## بەشی دووەم

## شاردنەوەی "قسەکەر" و هێنانی وەسف، وەك گوزارشتکەر

لـە هەنـدێك لـە دیمەنـەكانی قورئـانی پـیرۆزدا دیاردەیـەك هەسـت پێدەکەین، کە ئەویش بریتییە لە شاردنەوەی قسـەکەر و ئـەو وشـانەی کـە ئامـاژە بـۆ قسـەکردن دەکـات، وەك "وتـی ـ وتیـان ـ دەڵێـت ـ دەڵێن..."، ئـەم دیمەنانـە کـە دیمـەنی (ناچـیرۆکی – غـیر قصصـی)ن بابەتی جۆربـەجۆ دەگرنـە خـۆ، بـەڵام دوو شـت خـاڵی كۆكەرەوەیانـە، یەکـەمیان: وەسـفی کەسـێك یـان گرووپێـك دەکـات. دووەمـیش: لـە ناوەڕاسـتی ئـەو وەسـف و باسـکردنەدا، باسـەکە دەبڕێـت و قسـەیەك دەهێنێت کە ئەو کەسە یان ئەو گرووپە کردوویانە بەبێئەوەی چاوەڕێی ئەوە لەو قسەیە بکەین وەڵام بدرێتەوە، یان وتووێژ و حیـوارێکی نـوێی پێدروست ببێت، بەڵکو تەنها وەسفێکی تەواوەتی تایبەتمەندییەکی ئەو کەسە یان ئەو گرووپەیە، بەڵام بە شێوەی قسەیەك، یان وتەیـەك، یـان گوفتارێك دەربڕاوە، جـا ئـەو گوفتـارە بەبێئـەوەی وشـەی "وتـی، یـان وتیان" لە پێشـەوەی هـەبێت، هـاتووە، یـان بـەبێ ئـەوەی ئامـاژە بـۆ قسەکەر کرا بێـت، بـەڵکو بـە سـیاقی بابەتەکـەدا بۆمـان دەردەکـەوێت قسـەکەر کێیـە، بـەڵام هەنـدێکجار کەسـە باسـکراوەکە خـۆی کەسـی

قسەبۆکراو "موخاتەب"ـە، نەك قسەکەر بێت، با دیقەتی ئەم نموونانە بدەین:

١. ﴿ وَإِذَا رَءَاكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِن يَتَّخِذُونَكَ إِلَّا هُزُوًا أَهَٰذَا ٱلَّذِى يَذْكُرُ ءَالِهَتَكُمْ وَهُم بِذِكْرِ ٱلرَّحْمَٰنِ هُمْ كَٰفِرُونَ ﴾ (الانبیاء: ٣٦)

واتە: کاتێك ئەوانەی بێباوەڕ بوون تۆ دەبینن، هیچ کارێکیان لەدەستنایەت لەگەڵ تۆی بکەن جگە لە گاڵتە و گاڵتەجاڕیی: ئا ئەمەیە ناوی خواوەندەکانتان بە خراپە دەبات؟! لەکاتێکدا ئەوان هەمیشە بێباوەڕن بە قورئانی خوای میهرەبان).. لێرەدا ئەو کەسەی کە وتوویەتی: ﴿ أَهَٰذَا ٱلَّذِى يَذْكُرُ ءَالِهَتَكُمْ ﴾ دیار نییە، بەڵام بە سیاقی بابەتەکە دەردەکەوێت کە بێباوەڕان ئەو قسەیان کردووە، بەڵام بە هۆی لابردنی وشەی "وتیان" لە پێش ئەو قسەیەوە، وایکردووە کە گوێگر لە تەنها کەسێکی گوێگرەوە ببێت بە کەسێك کە بە تەواویی کەوتبێتە ناو ئەو بارودۆخەوە و بە چاوی خۆی ئەو دیمەنەی بێباوەڕان ببینێت کە کاتێك پێغەمبەر (درووود ی خوای لێبێت) دەبینن، دەڵێن: ئا ئەمەیە باسی خواوەندەکانتان دەکات، بەڵام ئەگەر وشەی "وتیان" لە پێش قسەکەوە باسبکرایە، ئەوا دیمەنەکە بەو شێوەیە کاریگەری نەدەبوو، بەڵکو دەبوو بە درێژەی ئەو وەسف و باسکردنەی کە لە سەرەتای ئایەتەکەوە هاتووە و لە دوای قسەکەشەوە درێژی پێدراوە، بەڵام ئەم بابەتە وەك چیرۆکە قورئانییەکانی دیکە، کە باسمان کردن، نییە، کە ئەم قسەیە ببێت بە سەرەتای وتووێژێکی نوێ، بەڵکو هەر دوا

به دوای قسەکە، ڕێڕەوی باسەکە دەگەڕێتەوە بۆ باری ئاسایی خۆی، کە گێڕانەوەی باسی بێباوەڕەکانە و دەفەرموێت: ﴿ وَهُم بِذِكْرِ ٱلرَّحْمَٰنِ هُمْ كَٰفِرُونَ ﴾ واتە: ئەوان بێباوەڕن بە یادی پەروەردگار، یان بە قورئان. ئەی بۆ لەو نێوانەدا گێڕانەوەکە پچڕاوە و قسەیەك هاتووە کە قسەکەر و وشەی "وتیان" تیایدا شاردراوەتەوە؟، هۆکارەکەی ئەوەیە تا ئەو قسەیە خۆی لە خۆیدا ببێت بە وەسفێکی گونجاوتر و وردتری ئەو بێباوەڕانە، واتە لە جیاتی ئەوەی باسێکی دوور و درێژی ئەو بێباوەڕانە بکات، لەجیاتیدا قسەیەکی خۆیان دەگوازێتەوە و پاشان دەگەڕێتەوە سەر باسەکە و ئەو قسەیەش باشترین گوزارشت لە وەسفی ئەو بێباوەڕانە دەکات..

هەندێکجاریش وشەی "وتیان ـ دەڵێن" لە پێش قسەکەوە هاتووە، بەڵام هەرکاتێك هاتبێت بۆ دەلالەتکردنە لەسەر ئەوەی ئەو قسەیە سیفەتێکی هەمیشەیی ئەو کەسانەیە و بەردەوام بەو شێوەیەن، سەیری ئەم نموونانە بکە: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْفُرُونَ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَيُرِيدُونَ أَن يُفَرِّقُواْ بَيْنَ ٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَيَقُولُونَ نُؤْمِنُ بِبَعْضٍ وَنَكْفُرُ بِبَعْضٍ وَيُرِيدُونَ أَن يَتَّخِذُواْ بَيْنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا ﴿١٥٠﴾ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ حَقًّا ﴾ (النساء: ١٥٠ ـ ١٥١) واتە: (بێگومان ئەوانەی باوەڕ بە خوا و پێغەمبەران ناهێنن و دەیانەوێت جیاوازی بکەن لە نێوان خوا و پێغەمبەرەکانیدا دەڵێن: باوەڕ دەهێنین بە هەندێك لە پێغەمبەران و باوەڕ بە هەندێکیان ناهێنین

و دەیانەوێت لەو نێوانەدا ڕێگە و بەرنامەیەك بۆ خۆیان بـەدەسـتبهێنن.

ئا ئەو کەسانە بەڕاستی هەر بێبـاوەڕن). ﴿ فَبِمَا نَقْضِهِم مِّيثَٰقَهُمْ وَكُفْرِهِم بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَقَتْلِهِمُ ٱلْأَنۢبِيَآءَ بِغَيْرِ حَقٍّ وَقَوْلِهِمْ قُلُوبُنَا غُلْفٌ ﴾ (النســـاء: ١٥٥)، لێرەدا دەبینین ئەو دوو سیفەتە کە بریتییە لە "باوەڕهێنان بە بەشێك لە کتێبە ئاسمانییەکان و بێباوەڕبوون بە هەندێکی دیکەیان"، هەروەها "دڵمان داخراوە و هیچ وەرناگرێـت"، ئـەو دوو سـیفەتە لـە پێشـیانەوە وشەی "یقولـون ـ قـولهم" هـاتووە، ئەمـەش دەرخـەری ئەوەیـە ئـەوان هەمیشە بەو شێوەیەن و هەمیشە ئەو قسەیە دەکەن.

٢. ﴿ وَإِذَا مَآ أُنزِلَتْ سُورَةٌ نَّظَرَ بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ هَلْ يَرَىٰكُم مِّنْ أَحَدٍ ثُمَّ ٱنصَرَفُوا۟ ﴾ (التوبه: ١٢٧) واتە: (کاتێکیش سوورەتێك لە قورئان دابەزێنرا ئەوە هەندێکیان تەماشای هەندێکی تریـان دەکـەن: ئایـا هـیچ کەس دەتانبینێت، پاشان بە نهێنی خۆیان دزییەوە و ڕۆیشتن).. دیقەت بفەرموون! تۆ بڵێی دیمەنێك هەبێت لـەم دیمەنـە قورئانییـە بـەهێزتر و کاریگـەرتر و ڕەوانبێـژتر بێـت لـە دەرخسـتنی شـێوازی قسـەکردن و هەڵســوکەوتی ئـــەو دووڕووانـــە... لێـــرەدا (نَّظَرَ بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ) هەندێکیان سـەیری هەنـدێکی دیکـەیان دەکـەن) دەبێتـە "هەڵدانـەوەی پەردە" لە شانۆکەدا و بینینی دیمەنەکەیان کە خۆیان بە زمانی خۆیان، ئابڕووی خۆیان دەبەن، جـا بـەو قسـەیەی خۆیـان وەسـفێکی پڕاوپـڕی کردوون کە بە "گێڕانەوە" ئەو وەسفە دروست نابێت...

٣ـ ٤ـ هەردوو نموونەی سێهەم و چوارەم بۆ خوێنەر جێدەهێڵین تا شیبکاتەوە، بۆ ئەوەی ئەویش بەشدار بێت لەگەڵماندا و پاداشتی وردبوونەوە و "تەدەببور"ی بەربکەوێت: ﴿وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مِن دُونِهِ أَوْلِيَاءَ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَىٰ﴾ (الزمر: ٣) واتە: (ئەوانەش جگە لەو زاتە کەسانی تر و شتی تر دەکەنە پشتیوانی خۆیان: ئێمە ئەم بت و شتانە ناپەرستین، تەنها لەبەر ئەوەی لە خوا نزیکمان بخەنەوە)،

﴿فَارْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِي السَّمَاءُ بِدُخَانٍ مُّبِينٍ ﴿١٠﴾ يَغْشَى النَّاسَ هَٰذَا عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١١﴾ رَّبَّنَا اكْشِفْ عَنَّا الْعَذَابَ إِنَّا مُؤْمِنُونَ ﴿١٢﴾﴾ (الدخان: ١٠ـــ ١٢) واتە: (چاوەڕێی ڕۆژێك بکە کە دوکەڵێکی ئاشکرا بەری ئاسمان دەگرێت. هەموو خەڵکی دادەگرێت: ئەمە سزا و ئازارێکی بە ئێشە. پەروەردگارا تۆ ئەم سزا و ئازارەمان لە کۆڵ بکەرەوە، بێگومان ئێمە باوەڕدارین)...

٥ـــ ئەم تایبەتمەندییە تەنها تایبەت نییە بە باسوخواسی سەرپێچیکاران، چ بێباوەڕان بن یان دووڕووان، بەڵکو بۆ باسوخواسی ئیماندارانیش هاتووە، بۆ نموونە: ﴿إِنَّ الْأَبْرَارَ يَشْرَبُونَ مِن كَأْسٍ كَانَ مِزَاجُهَا كَافُورًا ﴿٥﴾ عَيْنًا يَشْرَبُ بِهَا عِبَادُ اللَّهِ يُفَجِّرُونَهَا تَفْجِيرًا ﴿٦﴾ يُوفُونَ بِالنَّذْرِ وَيَخَافُونَ يَوْمًا كَانَ شَرُّهُ مُسْتَطِيرًا ﴿٧﴾ وَيُطْعِمُونَ الطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِ مِسْكِينًا وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا ﴿٨﴾ إِنَّمَا نُطْعِمُكُمْ لِوَجْهِ اللَّهِ لَا نُرِيدُ مِنكُمْ جَزَاءً وَلَا شُكُورًا ﴿٩﴾ إِنَّا نَخَافُ مِن رَّبِّنَا يَوْمًا عَبُوسًا قَمْطَرِيرًا ﴿١٠﴾ فَوَقَاهُمُ اللَّهُ شَرَّ ذَٰلِكَ الْيَوْمِ وَلَقَّاهُمْ نَضْرَةً وَسُرُورًا ﴿١١﴾﴾ (الانسان: ٥ ـ ١١) واتە: (بێگومان

چاکان و پاکانیش لە پەرداخێکی پڕ شەرابدا دەخۆنەوە، کە ئاوێتەکەی لە سەرچاوەی کافوورەوەیە. کە کانییەکە بەندەکانی خوا لێیدەخۆنەوە لە هەر شوێنێکدا بیانەوێت هەڵی دەقوڵێنن و فوارە دەکات. ئەو بەختەوەرانە، یەکێك لە سیفاتیان ئەوەیە: وەفا بە نەزر دەکەن، یاخود بەڵێنێکیان دا وەفادارن و ئەنجامی دەدەن و بیمیان هەیە لە ڕۆژێك کە شەڕی لێدەبارێت و پرش و بڵاوە. هەروەها نان و خۆراك دەبەخشن – ئەگەرچی خۆشەویستیش بێت لایان –، بە هەژار و هەتیوو و دیلەکان: بێگومان ئێمە ئەم خۆراکەتان هەر لەبەر خوا و بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی ئەو پێدەبەخشین، نە پاداشتمان لێتان دەوێت، نە سوپاس. ئەم کارە بۆیە دەکەین، چونکە لە ڕۆژێکی تاڵ و گرژ و ڕەش و تاریك دەترسین، کە پەروەردگارمان پێشی دەهێنێت. جا خوای گەورەش لە شەڕ و ناخۆشی و نەهامەتی ئەو ڕۆژە پاراستنی و رووی گەش و شادمانی پێبەخشین)..

دیقەت بفەرموون لە کاریگەریی ئەم دیمەنانە، کە مرۆڤ دەستەوسانە لە هێنانی نموونەی لەم شێوەیە. کات و سات: ڕۆژی دواییە. شوێن: بەهەشتە، کەسەکان: چاکەکارانن، خەریکی نۆشکردنی ناز و نیعمەتەکانی پەروەردگارن، وەك یەکێك پرسیار بکات کە چۆن ئەمانە، ئەم ناز و نیعمەتەیان شایستە بووە، وەڵامەکە بەوە دێتەوە کە ئەو بەڵێنەی دابوویان بە پەروەردگار هێنایانەدی و، سەرەڕای پێویستیی خۆیان بە خواردن، بەڵام ئەوان خواردنیان دەدا بە هەژار و بێباوك و

بەخسیرەکان.. تا ئێرە دیمەنەکە لە ناو بەهەشتدایە، بەڵام لێرەدا کتوپڕ بە شێوەی هونەری سینەمایی "فیدباك" واتە نیشاندانی دیمەنێك و پاشان لە ناو ئەو دیمەنەوە گەڕانەوە بۆ باسکردنی دیمەنێکی ڕابردوو، دەمانگێڕێتەوە بۆ ژیانی دونیا و قسەیەکی ئەو چاکەکارانەمان بۆ نقل دەکات ـ بەبێئەوەی وشەی "دەڵێن یان وتیان"ی لەگەڵدا هاتبێت ـ کە: لەبەرخاتری خوا ئێمە خواردن دەدەین بە ئێوە ئەی هەژار و بێباوك و بەخسیرەکان و هیچ پاداشتێکمان لە ئێوە ناوێت و ئێمە لە ڕۆژێکی ترسناك دەترسین، پاشان دێتەوە سەر باسە بنەڕەتییەکە و خوای گەورە بە شێوەی "گێڕانەوە و باسکردن" دەفەرموێت: خوا لەو ڕۆژە ترسناکە پاراستنی و خۆشیی خستە دڵیانەوە بە پاداشتی بەهەشت..

لێرەدا دیقەت دەدەین هەرچی هۆکاری سەرنجراکێشان هەیە لە هونەری چیرۆکدا، لێرەدا بەکارهاتوون، لابردنی ئەو پرسیارەی کە "چۆن شایستەی ئەم نیعمەتانە بوون"، لابردنی وشەی "وتیان" لە پێش "لەبەر خاتری خوا خۆراکتان پێدەدەین..."، بەوەش هەموو هەست و نەستەکان و ژیری و بیری مرۆڤ دەوروژێنێت بۆ وەرگرتنی ئەم دیمەنە ناوازەیە، کە لە ناو بەهەشتەوە دەمانهێنێتەوە بۆ ژیانی دونیا، تا خۆمان بە چاوی دڵ ئەو قسەیە لە زاری چاکەکارانەوە ببیستین و پاشان دەمانباتەوە بۆ بەهەشت و درێژەدان بە باسوخواسی چاکەکەران لەوێ...

٦ـ هەر لە بارەی چاکەکارانەوە، چەندین دیمەنی دیکەی هاوشێوە هاتووە، لەوانە: ﴿ ٱلَّذِينَ يَذۡكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمٗا وَقُعُودٗا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمۡ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلۡقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ رَبَّنَا مَا خَلَقۡتَ هَٰذَا بَٰطِلٗا سُبۡحَٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴾ (آل عمران: ١٩١) واتە: (ئەوانەی یادی خوا دەکەن لەکاتێکدا کە بە پێوەن، یان دانیشتوون، یان ڕاکشاون، هەمیشە بیردەکەنەوە لە دروستبوونی ئاسمانەکان و زەوی: پەروەردگارا، تۆ ئەم هەموو دروستکراوانەت بێهوودە و بێئامانج دروست نەکردووە، پاکیی و بێگەردیی شایستەی تۆیە، دە تۆش بمانپارێزە لە سزای ئاگری دۆزەخ)، هێندە ئەم دیمەنە کاریگەرە کە سەرەتا باسی چاکەکاران دەکات کە بە دانیشتن و بەپێوە یادی خوا دەکەن و بیر لە دروستبوونی ئاسمان و زەوی دەکەنەوە، لێرەدا نافەرموێت: ئەو چاکەکارانە لەو کاتی بیرکردنەوەیەدا دەڵێن خوایە ئەمەت بە هەوانتە دروست نەکردووە، بمانپارێزە لە ئاگر، بەڵکو دەستبەجێ و ڕاستەوخۆ قسەکەی هێناون تا دیمەنەکە نەپچڕێت و وەك بڵێی ئێمەی خوێنەر خۆمان بە گوێی خۆمان گوێمان لێیانە و چاومان لێیانە کە ئەو قسەیە لە زاریان دێتە دەرەوە، هەر لەبەر کاریگەرییەکەیشیەتی کە لە کۆتاییدا خوای گەورە بەهەمانشێوە وەڵامیان دەداتەوە و دەفەرموێت: ﴿ فَٱسۡتَجَابَ لَهُمۡ رَبُّهُمۡ أَنِّي لَآ أُضِيعُ عَمَلَ عَٰمِلٖ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰ ﴾، خوا وەڵامی داواکەیانی دایەوە: من کار و کردەوەی هیچ کام لە ئێوە نێر بێت یان

مـێ، زایـە ناکـەم... دووبـارە نافـەرموێت: خـوا وەڵامـی دانـەوە و فـەرمووی:....، بـەڵکو یەکسـەر و دەسـتبەجێ دیمـەنی وەڵامەکـەی پەروەردگار دەگوازێتەوە بۆمان بەبێ وشەی "فەرمووی"...

٧ـ با لێـرەدا دیمـەنێکی پـڕ لـە ناسـۆر و ناخهـەژێنی دیکـەش بـاس بکـەین، کـە دیمـەنی دایـك و باوکێکـە کـە گیریـان بەدەسـت کـوڕە لاسـارەکەیانەوە خـواردووە، ﴿ وَٱلَّذِى قَالَ لِوَٰلِدَيۡهِ أُفّٖ لَّكُمَآ أَتَعِدَانِنِيٓ أَنۡ أُخۡرَجَ وَقَدۡ خَلَتِ ٱلۡقُرُونُ مِن قَبۡلِي وَهُمَا يَسۡتَغِيثَانِ ٱللَّهَ وَيۡلَكَ ءَامِنۡ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞ فَيَقُولُ مَا هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴾ (الاحقاف: ١٧) واتە: (ئـەوەی کـە بـە بـاوك و دایکـی دەڵێـت: ئـۆف لەدەسـت ئێـوە، ئایـا ئێـوە هەڕەشـەم لێدەکەن بەوەی دوای مردن لە گۆڕ دەربهێنـرێم لەکاتێکـدا ئـەو هـەموو خەڵکـە پـێش مـن مـردوون و ڕۆیشـتوون. دایـك و باوکەکـەش لـە خـوا دەپاڕێنەوە. کوڕە هاوار بۆ تۆ باوەڕ بهێنە بێگومان بەڵێنی خوا ڕاستە، کەچی دەڵێت: ئەمە قسـەیەکی کۆنـە و داسـتانی پێشـووەکانە).. ئـەم دیمەنە سێ دێڕییەی قورئانی پیرۆز، کاریگەرییەکی زۆری هەیـە لەسـەر دەروون، وایکـردووە دیمـەنی ئـەو خانـەوادە کارەسـاتبارە بەرجەسـتە بکات بۆمان، ئەوەش بە بەکارخستنی هۆکارەکـانی گوزارشـتکردن وەك شێوازە ڕەوانبێژییەکان، لەوانەش لابردنی وشەکان...

لێرەدا چەند شـتێك لابـراوە، بـۆ ئـەوەی کاریگـەریی دیمەنەکـە پڕاوپـڕ بێت، لەوانە: کاتێك دەفەرموێت: (وَهُمَا يَسۡتَغِيثَانِ ٱللَّهَ) "دایك و باوکەکە لە

خوا دەپاڕێنەوە"، بەڵام پاڕانەوەکە باسناکات، بۆ ئەوەی خوێنەر خۆی بە بیری خۆی درك بەوە بکات پاڕانەوە و لاڵانەوەکە چییە، بێگومان لەدەست کوڕە لاسارەکەیانە، پاشان لابردنی وشەی "وتیان" لەپێش قسەکەیان بەرانبەر بە کوڕەکەیان کە دەڵێن: کوڕە هاوار بۆ تۆ، باوەڕ بهێنە... واتە ئەوان لە خوا دەپاڕێنەوە و پاشان ڕوو دەکەنەوە کوڕەکەیان و دەڵێن هاوار بۆ تۆ، باوەڕ بهێنە، لێرەدا هونەرێکی ڕەوانبێژی بەکارهاتووە کە پێیدەوترێت: ئاوڕدانەوە "التفات – ئیلتیفات" واتە قسەکردن ڕووەو کەسێك و پاشان کتوپڕ لاکردنەوە بەلای کەسێکی دیکەدا و قسەکردن لەگەڵیدا.. لێرەشدا بەهەمانشێوە: پاڕانەوە لە خوا ـ دەقی پاڕانەوەکە لابراوە ـ، پاشان ڕووکردنە کوڕەکەیان ـ بەبێئەوەی وشەی دەڵێن بەکاربهێنرێت ـ و قسەکردن لەگەڵیدا....

٨ـ لێرەدا دوو نموونەی دیکە باس دەکەین، کە مرۆڤ توانای بیستنی نییە و خوای گەورە خۆی بۆمان نەقڵ دەکات: ﴿ وَجَآءَتۡ سَكۡرَةُ ٱلۡمَوۡتِ بِٱلۡحَقِّۖ ذَٰلِكَ مَا كُنتَ مِنۡهُ تَحِيدُ ﴾ (ق: ١٩)، واتە: (تەنگانەی مردن و ئازارەکانی هات، هاوڕێ لەگەڵ ڕاستییەکاندا: ئا ئەوە ئەو بەسەرهات و ڕووداوەیە کە خۆتت لێ لادەدا و پەنات لێ دەگرت). وتەی: (ذَٰلِكَ مَا كُنتَ مِنۡهُ تَحِيدُ )، بەو کەسە دەوترێت کە لە حاڵەتی سەرەمەرگدایە، بەڵام توانای ئەوەی نییە ئەو قسە بۆ کەسەکانی دەوروبەری باس بکات، ئەو خۆی دەیبیستێت، بەڵام ناتوانێت بیگێڕێتەوە بۆ دەوروبەری، بەڵام

پـــەروەردگار بۆمـــانی دەگێڕێتـــەوە... بـــەبێ ئـــەوەی وشـــەی **"پـــێ یدەوترێت"** باس بکات، تا دیمەنەکە کاریگەریی ڕاستەوخۆی هـەبێت و مرۆڤ بخاتە هەمان ئەو دیمەنەوە، نەك وەك "گێڕانەوە" باسی بکات.

٩- هەروەها ئەم حاڵەتە لە چـیرۆکی خنکـانی فیرعەونیشـدا دووبـارە دەبێتـەوە، ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَدۡرَكَهُ ٱلۡغَرَقُ قَالَ ءَامَنتُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱلَّذِيٓ ءَامَنَتۡ بِهِۦ بَنُوٓاْ إِسۡرَٰٓءِيلَ وَأَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ﴿٩٠﴾ ءَآلۡـَٰٔنَ وَقَدۡ عَصَيۡتَ قَبۡلُ وَكُنتَ مِنَ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ﴿٩١﴾ ﴾ (یونس: ٩١) واتە: (تا ئەو کاتەی فیرعەون خەریك بوو دەخنکا وتی: وا ئیتر باوەڕم هێنا بەوەی کە هـیچ خوایـەك نییـە جگـە لـەو خوایـەی کـە نەوەی ئیسرائیل باوەڕیان پێهێناوە و من ئیتر لە موسڵمان و ملکەچانم. **ئایا ئێستە؟!**، لەکاتێکدا بەڕاسـتی پێشـتر یـاخیی بوویـت و لـە ڕیـزی ئەوانەدا بوویت کە تۆوی خراپەیان دەچـاند). کاتێـك فیرعـەون دەگاتـە حاڵـەتی خنکـان و گیاندەرچـوونی، دەڵێـت بـاوەڕم هێنـا بـەوەی هـیچ خوایەك نییە تەنها ئەوە نەبێت کە نەوەی ئیسرائیل باوەڕیان پێهێنـاوە و مـن لـە مسـولّمانانم. ئێسـتا باوەڕدەهێنیـت؟ لەکاتێکـدا پێشـتر سەرپێچیت کردووە.... لێرە وشەی **"پێمان وت"** لابراوە تا ڕاسـتەوخۆ گوێگر بخاتە ناو دیمەنەکەوە کە لە ناو دەریادا ڕوودەدات، بـەڵام کـەس ئاگای لێنەبووە تەنها خوای گەورە نەبێت، کە هەر خۆیشی دیمەنەکەی بۆ ئێمە گێڕاوەتەوە.

ئەم دوو نموونەیەی کۆتایی، لە دیمەنە پەنهان و غەیبییەکانە، کە بە بەکارهێنانی هۆکاری ئامادەکردن و خستنە بەرچاو، نزیکی کردووەتەوە

له بیر و هۆشی ئێمه و هێناویەتییه بەرچاومان، ئەو هۆکارەش قسەیەکه که وشەی "وتن" و "ڕاناوی قسەکەر"ی لێ لابراوه..

هەر لەم جۆرەیان، دوو نموونەی دیکە باس دەکەین، بەلام شیکردنەوەی بۆ خوێنەر جێدەهێڵین: ﴿ وَكُلَّ إِنسَٰنٍ أَلْزَمْنَٰهُ طَٰٓئِرَهُۥ فِى عُنُقِهِۦ ۖ وَنُخْرِجُ لَهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ كِتَٰبًا يَلْقَىٰهُ مَنشُورًا ﴿١٣﴾ ٱقْرَأْ كِتَٰبَكَ كَفَىٰ بِنَفْسِكَ ٱلْيَوْمَ عَلَيْكَ حَسِيبًا ﴿١٤﴾ ﴾ (الإسراء: ١٤)، واته:(نامەی کردەوەی هەر کەسێکیشمان هەڵواسیوه بە گەردنیدا و لە ڕۆژی دواییدا کارنامەی کردەوەکانی بۆ دەردەهێنین و بە کراوەیی دەیخەینە بەردەستی: دەی نامەی کردەوەکانت بخوێنەرەوه و تەماشای بکه، ئەمڕۆ هەر خۆت بڕیار بدە و حساب بۆ خۆت بکە). ﴿ لَا يَحْزُنُهُمُ ٱلْفَزَعُ ٱلْأَكْبَرُ وَتَتَلَقَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ هَٰذَا يَوْمُكُمُ ٱلَّذِى كُنتُمْ تُوعَدُونَ ﴾ (الأنبياء: ١٠٣)، واته (لێقەومانی گەورە و تەنگانەی بێ سنوور تووشی غەمباری و پەژارەیان ناکات، بەڵکو فریشەکان پێشوازییان لێدەکەن: ئەمە ئەو ڕۆژەیە کە کاتی خۆی بەڵێنیان پێدەدرا)... تۆی خوێنەر! بە سوودوەرگرتن لەو نموونانەی پێشوو، دەتوانیت ئەو دوو ئایەتە شیبکەیتەوە...

# بەشی سێهەم

# بەرجەستەکردنی دیمەنە غەیبییەکان

# لەڕێی شاردنەوەی وشەی ( قال )

یەکێك لەو تایبەتمەندییانەی کە حیوار و وتووێژ لەناو چیرۆك و گێڕانەوەکاندا دەولەمەند دەکات، بریتییە لە "ململانێ"، ململانێ واتە لەیەکگیرانی هەلوێست و بۆچوونەکان، کە ئەمەش لەڕێی بەرجەستەکردنی "هێز" و "بەرگری"یەوە دەبێت لە ناو حیوارەکەدا، ئەمە لە شانۆی یۆنانیدا هەبوو کە حیوار پەیوەست بوو بە ململانێوە، جا ئەگەر بێین ئەم یاسایە بەسەر دیمەنەکانی چیرۆکە قورئانییەکاندا جێبەجێ بکەین، دەبینین دەولەمەندترین حیوارەکانی چیرۆکەکانی قورئان ئەو حیوارانەن کە لە نێوان پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێبێت) لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە بە درۆیان دەزانین، ڕوویداوە. لەناو ئەوانەشدا پشکی زۆر بەر حیوارەکانی مووسا (سەلامی خوای لێبێت) لەگەڵ فیرعەون لە لایەك و مووسا لەگەڵ نەوەی ئیسرائیل لە لایەکی دیکەوە، دەکەوێت.

جا ئەو دیمەنانەی کە زۆر لە قورئاندا هەن سەبارەت بەم باسە، زیاتر باسی جیهانی پەنهان و غەیبی کردووە، لەو دیمەنانەدا ئەوەی جێی تێبینییە لابردنی وشەی "قال" "وتی - دەڵێت "ـە لە نێوان

حیوارەکاندا، بەجۆرێك لە کاتی باسکردنی دیمەنەکانی ئەهلی خراپە و شەڕ، بووە بە نیمچە یاسایەك کە هەرچی "وتی ـ دەڵێت" لابراوە و یەکسەر دیمەنەکە نقڵ کراوە.

## سەیری ئەم نموونانە بکە:

١. ﴿ يَوْمَ تَبْيَضُّ وُجُوهٌ وَتَسْوَدُّ وُجُوهٌ ۚ فَأَمَّا الَّذِينَ اسْوَدَّتْ وُجُوهُهُمْ أَكَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ فَذُوقُوا الْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ ﴿١٠٦﴾ ﴾ (آل عمران).

٢. ﴿ وَلَوْ تَرَىٰ إِذْ يَتَوَفَّى الَّذِينَ كَفَرُوا ۙ الْمَلَائِكَةُ يَضْرِبُونَ وُجُوهَهُمْ وَأَدْبَارَهُمْ وَذُوقُوا عَذَابَ الْحَرِيقِ ﴿٥٠﴾ ذَٰلِكَ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيكُمْ وَأَنَّ اللَّهَ لَيْسَ بِظَلَّامٍ لِّلْعَبِيدِ ﴿٥١﴾ ﴾ (الانفال).

٣. ﴿ يَوْمَ يُحْمَىٰ عَلَيْهَا فِي نَارِ جَهَنَّمَ فَتُكْوَىٰ بِهَا جِبَاهُهُمْ وَجُنُوبُهُمْ وَظُهُورُهُمْ ۖ هَٰذَا مَا كَنَزْتُمْ لِأَنفُسِكُمْ فَذُوقُوا مَا كُنتُمْ تَكْنِزُونَ ﴾ (التوبة).

٤. ﴿ تَلْفَحُ وُجُوهَهُمُ النَّارُ وَهُمْ فِيهَا كَالِحُونَ ﴿١٠٤﴾ أَلَمْ تَكُنْ آيَاتِي تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ فَكُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ ﴿١٠٥﴾ قَالُوا رَبَّنَا غَلَبَتْ عَلَيْنَا شِقْوَتُنَا وَكُنَّا قَوْمًا ضَالِّينَ ﴾ (المؤمنون).

٥. ﴿ وَهُمْ يَصْطَرِخُونَ فِيهَا رَبَّنَا أَخْرِجْنَا نَعْمَلْ صَالِحًا غَيْرَ الَّذِي كُنَّا نَعْمَلُ ۚ أَوَلَمْ نُعَمِّرْكُم مَّا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَن تَذَكَّرَ وَجَاءَكُمُ النَّذِيرُ ۖ فَذُوقُوا فَمَا لِلظَّالِمِينَ مِن نَّصِيرٍ ﴾ (فاطر).

ئەمە جگە لە چەندین حیواری دیکە کە خوێنەر خۆی دەتوانێت هاوشێوەکانی لە سوورەتەکانی دیکەی قورئاندا ببینێتەوە، بەڵام ئێمە لێرەدا ئاماژە بە چەند خاڵێك دەکەین:

١ـ خاڵی سەرەکی کۆکەرەوەی ئەم دیمەنانە، بریتییە لەوەی کە باس لە دیمەنی غەیبی و جیهانی پەنهان دەکات، کە بە هیچ جۆرێك بەهەستەوەرەکانی مرۆڤ درك ناکرێن، چوارچێوەی زەمان و مەکان نایانگرێتە خۆ، تەنها ئیمان و باوەڕە ئەم دیمەنانە دێننە بەر دیدە و نمایش، ئەوە قورئانە کە سوورە لەسەر هێنانی دیمەنەکانی جیهانەکانی دیکەی بەدەر لە درکی مرۆڤ، چ لە بارەی زەمەنەوە کە دیمەنی پێش زەمەن وەك دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی و پاش زەمەن وەك دیمەنەکانی دوای ڕۆژی دوایی دەخاتە ڕوو، هەروەها لە بارەی شوێن، کە دیمەنی ئەو شوێنانەی کە هێشتا زانست پەی پێنەبردووە، وەك "عەرشی پەروەردگار و بەهەشت و دۆزەخ"... بە چەندین شێواز و میکانزمی گونجاو ئەم دیمەنانە دەخاتە ڕوو.

٢ـ زۆرینەی ئەو دیمەنانەی غەیب، لە بارەی بێباوەڕانەوەیە و کەمترینیان لە بارەی باوەڕدارانەوەیە، لەبەرئەوەشە دەبینین ئەم حیوارانە زۆرترین وشەکانی "سەرزەنشتکردن و بێدەنگکردن و بەسووك سەیرکردن"ی تێدایە... ئەمە جگە لەبیرهێنانەوەی تاوانەکانیان کە ئەم ڕۆژەی بەسەر هێنان... بۆ نموونە:

﴿أَكَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَٰنِكُمْ فَذُوقُوا۟ ٱلْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ ﴿١٠٦﴾﴾ (آل عمران).

﴿ وَذُوقُواْ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ ۝٥٠ ذَٰلِكَ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيكُمْ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيْسَ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ ۝٥١ ﴾ (الانفال).

﴿ هَٰذَا مَا كَنَزْتُمْ لِأَنفُسِكُمْ فَذُوقُواْ مَا كُنتُمْ تَكْنِزُونَ ۝٣٥ ﴾ (التوبة).

(﴿ ذَٰلِكَ بِمَا قَدَّمَتْ يَدَاكَ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيْسَ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ ۝١٠ ﴾ (الحج).

(﴿ أَلَمْ تَكُنْ ءَايَٰتِى تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ فَكُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ ۝١٠٥ ﴾ (المؤمنون).

(﴿ فَذُوقُواْ بِمَا نَسِيتُمْ لِقَآءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَآ إِنَّا نَسِينَٰكُمْ وَذُوقُواْ عَذَابَ ٱلْخُلْدِ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ۝١٤ ﴾ (السجدة).

(﴿ ذُوقُواْ فِتْنَتَكُمْ هَٰذَا ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تَسْتَعْجِلُونَ ۝١٤ ﴾(الذاريات)

**هەروەها چەندین ئایەتی دیکەش، کە زۆرینەی دەستەواژەکانیان بە شێوازی "ئێستا"، یان "ڕابردوو"، باسەکانی هێنراون، وەك ئاماژەیەك بۆ ئەوەی کە ئەو ڕووداوانە بە تەواویی لەڕوودانـدان، یـان بـە ڕاستیی پێشتر ڕوویانداوە، کە ئاماژەن بۆ جەختکردنـەوە لـە ڕوودانیـان، ئەمـە جگە لە لابردنی وشەی "وتـی ـ دەڵێـت" تـا گـوێگر هەست بکـات ئـەم وتانە لەگەڵ ئەویانە..**

**٣ــ ئــەم دیمەنانــە لەبەرئــەوەی لــەبارەی سەرپێچــیکاران و گوناهکارانەوەیـە، پڕیـەتی لـە دەسـتەواژەی "پەشـیمانی و ئـاه و ناڵـە هەڵکێشان و تکا و پاڕانەوە و ترس و تۆقین"... سەرنجی ئەم دیمەنانە بدە:**

﴿ رَبَّنَآ أَبۡصَرۡنَا وَسَمِعۡنَا فَٱرۡجِعۡنَا نَعۡمَلۡ صَٰلِحًا إِنَّا مُوقِنُونَ ﴾(السجدة: ١٢).

﴿ رَبَّنَآ أَخۡرِجۡنَا نَعۡمَلۡ صَٰلِحًا غَيۡرَ ٱلَّذِي كُنَّا نَعۡمَلُۚ ﴾(فاطر: ٣٧).

﴿ رَّبَّنَا ٱكۡشِفۡ عَنَّا ٱلۡعَذَابَ إِنَّا مُؤۡمِنُونَ ﴾(الدخان: ١٢).

﴿ يَٰلَيۡتَنِي لَمۡ أُوتَ كِتَٰبِيَهۡ (٢٥) وَلَمۡ أَدۡرِ مَا حِسَابِيَهۡ (٢٦) يَٰلَيۡتَهَا كَانَتِ ٱلۡقَاضِيَةَ (٢٧) مَآ أَغۡنَىٰ عَنِّي مَالِيَهۡۜ (٢٨) هَلَكَ عَنِّي سُلۡطَٰنِيَهۡ ﴾(الحاقة: ٢٥- ٢٩).

﴿ يَٰوَيۡلَنَا قَدۡ كُنَّا فِي غَفۡلَةٖ مِّنۡ هَٰذَا بَلۡ كُنَّا ظَٰلِمِينَ ﴾(الأنبياء: ٩٧).

﴿ رَبَّنَآ أَخِّرۡنَآ إِلَىٰٓ أَجَلٖ قَرِيبٖ نُّجِبۡ دَعۡوَتَكَ وَنَتَّبِعِ ٱلرُّسُلَ ﴾(ابراهيم: ٤٤).

﴿ رَبَّنَا غَلَبَتۡ عَلَيۡنَا شِقۡوَتُنَا وَكُنَّا قَوۡمٗا ضَآلِّينَ ﴾(المؤمنون ١٠٦).

**٤- ئەم حیوار و وتوویژانە چەند جۆریکن، بەشیکیان ئەو حیوارانەن کە لیکدەرەوانی قورئان دەڵین وتوویژی فریشتەکانن لەگەڵ ئەو گوناهکارانە، هەندیکیان وتوویژی نیوان نیشتەجێیانی دۆزەخ خۆیانە، یان لە نیوان نیشتەجێیانی دۆزەخ و نیشتەجێیانی بەهەشت، جا ئەو "ململانێ"یانە هۆکاریکی گرنگن بۆ دەوڵەمەندکردنی وتوویژ و حیوارەکان و جوڵاندنی ڕووداوەکان.**

**٥- لە هەندیك لەم وتوویژانەدا "لابردن – حەذف" نیشانەیەکی دیارە، وە بۆ چەندین مەبەست هاتووە، وەك ئاڕاستەکردنی وتە لەلایەن قسەکەرەوە بۆ قسەبۆکراویك و کتوپڕ گۆڕینی بۆ قسەبۆکراویکی دیکە، بۆ نموونە:**

﴿ ٱحۡشُرُواْ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ وَأَزۡوَٰجَهُمۡ وَمَا كَانُواْ يَعۡبُدُونَ ﴿٢٢﴾ مِن دُونِ ٱللَّهِ فَٱهۡدُوهُمۡ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلۡجَحِيمِ ﴿٢٣﴾ وَقِفُوهُمۡۖ إِنَّهُم مَّسۡـُٔولُونَ ﴿٢٤﴾ مَا لَكُمۡ لَا تَنَاصَرُونَ ﴾ (الصـــافات: ٢٢ـ ٢٥)... سەرەتای قسەکە، ئاڕاستەی بێباوەڕان کراوە، پاشان هەمان قسە ئاڕاستەی فریشتەکان کراوە کە تاوانباران ببەن بۆ دۆزەخ، پاشان سەرلەنوێ قسەکە ئاڕاستەی بێباوەڕان کراوەتەوە کە لە دۆزەخدا کۆکراونەتەوە، لەنێوان ئەم وتووێژانەشدا هەموو ئەو ئاماژانەی کە بەڵگەی ئەم گۆڕانەن، لابراون و حەذف بوون، وەك وشەی "وتی - دەڵێت"...

با ئەم نموونەیە شیی بکەینەوە، کە یەکێکە لە دیالۆگە دەوڵەمەندەکان لە واتا و دەستەواژەی کاریگەردا:

﴿ لَّقَدۡ كُنتَ فِي غَفۡلَةٖ مِّنۡ هَٰذَا فَكَشَفۡنَا عَنكَ غِطَآءَكَ فَبَصَرُكَ ٱلۡيَوۡمَ حَدِيدٞ ﴿٢٢﴾ وَقَالَ قَرِينُهُۥ هَٰذَا مَا لَدَيَّ عَتِيدٌ ﴿٢٣﴾ أَلۡقِيَا فِي جَهَنَّمَ كُلَّ كَفَّارٍ عَنِيدٖ ﴿٢٤﴾ مَّنَّاعٖ لِّلۡخَيۡرِ مُعۡتَدٖ مُّرِيبٍ ﴿٢٥﴾ ٱلَّذِي جَعَلَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَأَلۡقِيَاهُ فِي ٱلۡعَذَابِ ٱلشَّدِيدِ ﴿٢٦﴾ ۞ قَالَ قَرِينُهُۥ رَبَّنَا مَآ أَطۡغَيۡتُهُۥ وَلَٰكِن كَانَ فِي ضَلَٰلِۭ بَعِيدٖ ﴿٢٧﴾ قَالَ لَا تَخۡتَصِمُواْ لَدَيَّ وَقَدۡ قَدَّمۡتُ إِلَيۡكُم بِٱلۡوَعِيدِ ﴾ (ق: ٢٢ـ ٢٨)، واتە: (سوێند بە خوا، بەڕاستی تۆ لەم ڕووداوانە بێئاگا بوویت و گوێی خۆتت لێخەواندبوو، ئێستاش ئێمە پەردەمان لەسەر چاوەکانت لاداوە و چاوەکانت تیژن. هەروەها فریشتەی هاوەڵ و چاودێری دەڵێت: هەرچی کار و کردەوەکانی هەیە ئەوەتە لای من تۆمارم کردوون. هەرچی بێباوەڕێکی سەرکەش هەیە فڕێی بدەنە ناو

دۆزەخەوە. ئەوەی کە هەمیشە بە توونـدیی قەدەغـەی هـەموو خێـر و چاکەیەکی دەکرد، مافی خەڵکیی پێشێل دەکرد، خۆی بە گومـان بـوو و خەڵکیشی دەخستە گومانەوە. ئەوەبوو کە هاوەڵ و شەریکی بۆ خوا بە ڕەوا دەزانی، کەواتە هەردووکتان ئەو ئادەمییە فڕێ بدەنـە نـاو سـزای سەختەوە. هاوەڵ "قەرین"ـەکەی دەڵێت پەروەردگارا! مـن لەخشـتەم نەبردووە و سەرکەشم نەکردووە، بەڵکو خۆی لە نێو گومڕاییەکی دووردا نقووم بوو بوو. خوا فەرمووی: شـەڕە قسـە و دەمـەدەمێ لـە لای منـدا مەکەن، بەڕاستی مـن پێشـتر هەڕەشـەی هـاتنی ئـەم ڕۆژەم خسـتبووە بەرچاوتان و پێم ڕاگەیاندبوون).

سـەرەتا پێشکەشـکردنێکی کـورتی دیمەنەکـە، دواتـر کتـوپڕ دەگوازرێتـەوە بـۆ ئاڕاسـتەکردنی قسـە بـۆ ئـەو کەسـەی کـە بـەرەو لێپرسینەوە دەبرێت: (لقد كنت في غفلة... بەڕاسـتی تـۆ لـەم ڕووداوانـە بێئاگا بوویـت و گـوێی خۆتـت لێخەوانـدبوو، ئێسـتاش ئێمـە پـەردەمان لەسەر چاوەکانت لاداوە و چاوەکانت تیژن)، بەڵام گوێگر هیچ شتێك لە بارەی وەڵامی ئەو کەسە نابیستێت، وەڵامی نییە، بەڵکو وەڵام لە لایەن فریشتەی هـاوەڵ و چـاودێری "قـەرین"ـەکەیەوە دێـت: (هـذا مـا لـدي عتيـد.. هەرچـی کـار و کردەوەکـانی هەیـە ئەوەتـە لای مـن تۆمـارم کردوون)، قسەکەیشی بـە **"وقـال"** دەسـتپێدەکات... پاشـان فـەرمانی ئیلاهیـی بـێ پێشـینە دێـت: (ألقيـا في جهـنم... هەرچـی بێبـاوەڕێکی سەرکەش هەیە فڕێی بدەنە ناو دۆزەخەوە)، ئـەم قسـەیەش ئاڕاسـتەی

کەسی قسەبۆکراوی یەکەم نەکراوە، بەڵکو ئاڕاستەی دووان لە فریشتەکانی دۆزەخ کراوە، تا سزاکە بەسەر تاوانکارەکەدا جێبەجێ بکەن و هەڵیبدەنە دۆزەخەوە، پاشان قسەیەك لە لایەن قەرینەکەوە دێت، کە نازانین بۆچی کردوویەتی، یان وەڵامی چیی داوەتەوە، کە دەڵێت: (ربنا ما أطغيته... پەروەردگارا! من لە خشتەم نەبردووە و سەرکەشم نەکردووە، بەڵکو خۆی لە نێو گومڕاییەکی دووردا نقوم بووبوو)، خوای گەورە وەڵامی ئەم قسەیە دەداتەوە و دەفەرموێت: (لا تختصموا لدي.. شەڕە قسە و دەمەدەمێ لە لای مندا مەکەن)، لەکاتێکدا ئێمە گوێمان لە شەڕە قسە و دەمەقاڵە نەبووە لە نێوان تاوانکار و قەرینەکەی، کەچی خوای گەورە دەفەرموێت دەمەقاڵە مەکەن، کەواتە دەمەقاڵەیەك بوونی هەیە، وتووێژێکی دیکە بوونی هەیە، بەڵام شاراوەیە، ئەم وشەیەش "دەمەقاڵە مەکەن" یەکەم تاڵە دەزووە کە دەستی پێوە بگرین تا بە وتووێژەکەدا بچینەوە، بەڵکو شوێنەوار و ڕەنگدانەوەی ئەو دەمەقاڵەیە بدۆزینەوە، یان شتێك لەو حیوارە شاراوەیە ئاشکرا بکەین.

ئەم حیوارە، بە گشتی، چوار لایەنی تێدایە، کە ئامادەن و حزوریان هەیە لەو دیمەنەی کە ئێمەش وەك گوێگر ئامادەین تیایدا:

یەکەم: زاتی باڵای پەروەردگار، دوور لە هەر شوبهاندن و بەرجەستەکردن و هاوشێوەبۆدانان.

دووەم: فریشتەکان کە تاوانبار دەبەن بۆ دۆزەخ و فەرمان جێبەجێ دەکەن، لە ناویاندا دووان هەن لەم حیوارەدا کە "سائق و شهید"ن، کە باسیان هاتووە لێرەدا، ئیتر ژمارەی ئەوانی دیکە نازانین.

سێهەم: ئەو تاوانبارەی کە بۆ لێپرسینەوە دەبرێت، کە مرۆڤە.

چوارەم: قەرینەکە، ئەو کەسایەتییە سەرسامکەرەی کە لەوێ بوونی هەیە!!.

بەڵام لەگەڵ بوونی ئەم چوار لایەنە، ئێمەی گوێگر تەنها گوێمـان لـە قسـەی پـەروەردگار و وتەکانیـەتی، هـەروەها قسـەی قەرینەکـە و وەڵامەکەی، پاشتر پەروەردگار کۆتایی بە دەمەقاڵـە و شـەڕە قسـەیەك دەهێنێت کە لە خزمەت ئەودا روودەدات.. کەواتە بێگومان دەبێت چەند بەشێکی شاراوەی ئـەو وتووێـژە بـوونی هـەبێت، دەبێـت بەڵگەیـەکیش دەستبکەوێت لەسەر بوونی ئەو وتووێژە شاراوەیە.

دیقـەت بفـەرموون! سـەرەتای قسـەکان بـە وتەیـەکی پـەروەردگار دەستپێدەکات، کە مرۆڤە تاوانکارەکە وەڵامی نەداتـەوە، واتـە وەڵامـی ئەوی تێدا نییە، بە دوایدا "وقال قرینه..." دێت، ئەم "واو"ە کە لەگەڵ "قال"ـەکەدا هاتووە، بەڵگەیە لەسەر بـوونی وتـە و قسـە و حیـوارێکی دیکە، کە بە پیتی واوی عەتف "واو العطف" و "قال"ـەکە تەواو کـراوە و تەکمیلە کراوە... کە پێدەچێت قسەکە ئەوەبێت کە کـابرای تاوانکـار وتبێتی: ﴿يَوَيْلَنَا هَٰذَا يَوْمُ ٱلدِّينِ﴾ قوڕبەسەرمان ئەمە ڕۆژی لێپرسینەوە و پاداشـت و سـزایە، یـان وتبـێتی: ﴿رَبَّنَآ أَبْصَرْنَا وَسَمِعْنَا﴾، خوایـە!

بینیمان و بیستمان...، یان شتێکی لەو شێوەیە کە لە جێگەی دیکەی قورئاندا هاتووە، پاشان قەرینەکە دەڵێت ئەمە کار و کردەوەکانی هەمووی لای من تۆمارکراوە و ئائەمەیە..

ئەم دیمەنە شاراوەیە، تاکە هۆکارە بۆ هاتنی ئەو "واوە" کە لەگەڵ "قال"ـەکەدا هاتووە و بۆ "قال"ـەکەش و بۆ ئەو قسەیەی قەرینەکەش کە بەبێ ئەم قسەیەی کابرای تاوانکار، دەبێتە قسەیەکی بێناوەرۆك لە شوێنەکەیدا.. پاشان بۆمان دەردەکەوێت کە وتووێژەکە بەمشێوەیەیە کە ئەو فریشتە هاونشینەی کەسە تاوانکارەکە بە ئەرکێك ڕاسپێردراوە لە ژیانی دونیای ئەو کابرایەدا، کە بریتییە لە نووسین و تۆمارکردنی سەرجەم کار و کردەوەکانی کابرا، جا ئەوە ئێستا کاتی ئەوەیە ئەو قەرینە ڕاپۆرتی خۆی پێشکەش بکات سەبارەت بە ئەنجامی کارەکەی و ئەو کردەوانەش دەخرێنەوە بەردەم کابرای تاوانکار و دەکێشرێن و لێپرسینەوەکەی بەوە کۆتایی دێت کە ببرێت بۆ دۆزەخ، بەڵام کابرا لەوێدا کە نەیدەزانی هەموو کار و کردەوەکانی بەو وردییە ئەژمار دەکرێت لەسەری، دەستدەکات بە تاوانبارکردنی قەرینەکەی، واتە فریشتە هاونشینەکەی کە کردەوەکانی ئەمی تۆمارکردووە، بەوە تۆمەتباری دەکات کە ئەو ئەم شتانەی بۆ هەڵبەستووە و ئەم کارانە ئەم نەیکردووە، یاخود خەتای ئەو بووە کە ئەم کارانەی لا جوان کردووە و بۆی ڕازاندووەتەوە.. لەو کاتەدا بۆ ڕەتکردنەوەی ئەو تۆمەتە فریشتە هاونشینەکە "قەرین"ـەکە، وەڵامی دەداتەوە و دەڵێت: "ربنا

ما أطغيتـه... خوايـه مـن گـومڕام نـەكردووە، بـەڵكو ئـەو خـۆی لـە گومڕاييـەكی دووردا بـووە"... ئەمـەش وەڵامێكـی لۆژيكانـەی ئـەو تۆمەتەيـە.. بەڵگـەی ئـەم وتووێـژە شـاراوەيەش، ئـەو وەڵامـەی پـەروەردگاری بـەرز و بڵنـدە كـە ديمەنەكـەی پـێ كۆتـايی دێـت و دەمەقاڵەكەش دەبڕێنێتەوە كە دەفەرموێت: "لا تختصموا لدي.... لای من دەمەقاڵە مەكەن".

## بەكارهێنانی كاريگەرييە دەنگی و ڕەنگييەكان لە ديمەنە غەيبييەكاندا:

لـە هەنـدێك لـەو ديمەنانـەدا كـە بـاس لـە جيهـانی غـەيب دەكـەن، كاريگەرييە دەنگی و ڕەنگييەكان وەك كەرەستەی بيناكردنی ديمەنەكە، بەكارهێنراون. لێرەدا باس لە ديمەنێكی وتووێژی نێوان ئەهلی بەهەشت و ئـەهلی دۆزەخ دەكـەين، تـا ببيـنين بـە چ تـەكنيكێكی سـەرنجڕاكێش وتووێژ و حيوارەكان پێشكەش دەكرێن.

ديمەنەكە، وێنەی باوەڕداران نيشان دەدات كـە بـە ڕێگـاوەن بـەرەو بەهەشـت، نـوور و ڕووناكييەكەشـيان لەگەڵيانداڀـە، جـا ئـەم نـوور و ڕووناكييـە (كـە بابـەتی سـەرەكيی ئـەم باسـەيە لێـرەدا و يەكێكـە لـە كاريگەرييە ڕەنگيی و بينراوەكان) ڕۆڵی گرنگ دەبينێت لەم حيوارەدا.. وتووێژەكە بە پيرۆزباييەكی فريشتەكان دەستپێدەكات لـە بـاوەڕداران، كـە سـەرەنجاميان گەيشـتووەتە بەهەشـت: ﴿بُشْرَىٰكُمُ ٱلْيَوْمَ جَنَّٰتٌ تَجْرِى مِن

﴿ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴾ (الحديد: ١٢)، واته: (مژده‌بێت لێتان به‌هه‌شتانێك كه‌ ڕووباره‌كان به‌ ژێریاندا ده‌ڕۆن، به‌ هه‌میشه‌یی تێیدا ده‌مێننه‌وه‌، ئه‌وه‌ بردنه‌وه‌ی گه‌وره‌یه‌).. هه‌ر له‌و ڕۆژه‌دا دووڕووه‌كان - نه‌ك بێباوه‌ڕان - ئه‌و نووره‌ ده‌بینن، تكا له‌ باوه‌ڕداران ده‌كه‌ن: ﴿ ٱنظُرُونَا نَقۡتَبِسۡ مِن نُّورِكُمۡ ﴾ (الحديد: ١٣) واته‌: (ده‌ ته‌ماشایه‌كمان بكه‌ن با له‌ نووره‌كه‌ی ئێوه‌ شتێك وه‌ربگرین)، ئا لێره‌دا ده‌ستپێشخه‌رییه‌كی پێكه‌نیناوی - ئه‌گه‌ر دروست بێت وا بڵێین - دروست ده‌بێت بۆ مامه‌ڵه‌كردن له‌گه‌ڵ ئه‌و دووڕووانه‌دا به‌هه‌مانشێوه‌ی مامه‌ڵه‌كردنی خۆیان كه‌ گاڵته‌باز و گاڵته‌جاڕ بوون، واته‌ به‌ شێوه‌ی خه‌ڵه‌تاندنیان كه‌ خۆیان كار و پیشه‌یان بووه‌ له‌ دونیادا، له‌و كاته‌دا ده‌نگێكی په‌نهان و غه‌یبی دێته‌ گوێیان كه‌ پێیانده‌ڵێت: ﴿ ٱرۡجِعُواْ وَرَآءَكُمۡ فَٱلۡتَمِسُواْ نُورٗا ﴾ (الحديد: ١٣) واته‌: (بگه‌ڕێنه‌وه‌ نوور ده‌ستی خۆتان بخه‌ن)... ئه‌وانیش باوه‌ڕ ده‌كه‌ن به‌وه‌ی پێیانوتراوه‌. به‌وه‌ش ده‌كه‌ونه‌ ته‌ڵه‌كه‌وه‌ و به‌ په‌له‌ ده‌گه‌ڕێنه‌وه‌ بۆ دواوه‌، ئه‌و كات له‌ نێوان هه‌ردوو گرۆهه‌كه‌دا: گرۆی ئیمانداران و گرۆی دووڕووان، دیوارێك داده‌نرێت كه‌ ده‌رگای هه‌یه‌، ڕووی ناوه‌وه‌ی كه‌ ڕوو به‌ ئیماندارانه‌، نوور و ڕه‌حمه‌ته‌، ڕووی ده‌ره‌وه‌یشی كه‌ ڕوو به‌ دووڕووه‌كانه‌ ئاگر و سزایه‌. جا هێشتنه‌وه‌ی ئه‌م ده‌رگایه‌ - دیقه‌ت بده‌ن ده‌رگاكه‌ له‌ ناو دیواره‌كه‌دا هێڵراوه‌ته‌وه‌ -، هێشتنه‌وه‌ی ئه‌و ده‌رگایه‌ كه‌ دووڕووان له‌ ڕێیه‌وه‌

باوەڕداران دەبینین لەودیویەوە، بۆ زیادکردنی سزا و ئەشکەنجەیانە، جا لە ڕێی ئەم دەرگایەوە دووڕووان بانگی باوەڕداران دەکەن: ﴿أَلَمْ نَكُن مَّعَكُمْ﴾، واتـە: (ئـەی ئێمـە لەگـەڵتان نـەبووین). بـاوەڕداران دەڵـێن: ﴿بَلَىٰ وَلَٰكِنَّكُمْ فَتَنتُمْ أَنفُسَكُمْ وَتَرَبَّصْتُمْ وَارْتَبْتُمْ وَغَرَّتْكُمُ الْأَمَانِيُّ حَتَّىٰ جَاءَ أَمْرُ اللَّهِ وَغَرَّكُم بِاللَّهِ الْغَرُورُ ﴿١٤﴾ فَالْيَوْمَ لَا يُؤْخَذُ مِنكُمْ فِدْيَةٌ وَلَا مِنَ الَّذِينَ كَفَرُوا مَأْوَاكُمُ النَّارُ هِيَ مَوْلَاكُمْ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ ﴿١٥﴾﴾ (الحديـد: ١٤ــ ١٥) واتـە: (بـەڵێ، بـەڵام (بـە هـۆی دووڕوویـی) ئێـوە خۆتـان تووشـی بـەڵا کـرد، وە چـاوەڕوانیتان کـرد و دڕدۆنگی و دوو دڵیتان کرد، وە ئارەزوو (و خەیاڵاتی بـێ جـێ) ئێـوەی فریو دا، تا فەرمانی خودا (لـەبارەی مـەرگتان) هاتـە دی، وە شـەیتانی فریودەر لە بارەی خـودا فریـوی دان. جـا ئـەوڕۆ نـە لـە ئێـوە و نـە لـە کافران فیدیە و تاوانە وەرناگیرێت، جێگا و ڕێگاتان ئاوری جەهەننەمـە، جەهەننەم سەرپەرست و سەروەرتانە، چەندە چـارەنووس و ئاکـامێکی خراپە!).

جا یەکێکی دیکە لەو خاڵانەی کە لەم وتووێـژەدا پێویسـتە ئامـاژەی بۆ بکەین، ئەوەیە کە لە نێوان (باسکردن و باسنەکردنی وشەی (وتـی - دەڵێت)دا، پلەیەکی ناوەنـدیی هەیـە، کـە بریتییـە لـە هێنـانی وشـەکە، بەڵام بە شێوەی "بکـەر نادیـار"، واتـە نازانرێـت کـێ قسـەکە دەکـات: ﴿قِيلَ ارْجِعُوا وَرَاءَكُمْ فَالْتَمِسُوا نُورًا﴾ واتـە "قیـل"، "وتـرا"، کـێ وتـی، نازانرێت.. جا قسەکەر لێرەدا پـەروەردگاری بـاڵا نییـە، لەبـەر ئـەوەی

وتنەکە لێرەدا بۆ گاڵتەپێکردنە، ئەگەرنا کاتێك بەو دووڕووانە دەوترێت بگەڕێنەوە نوور دەستخۆتان بخەن، خۆ هیچ نوورێك بوونی نییە، کەواتە قسەکەر پەروەردگار نییە، پەروەردگار دوورە لە وتنی شتێکی ناڕاست "سبحانه وتعالی".. ناشتوانین قسەکەرێك لێرەدا دیاری بکەین بڵێین ئەوە، ئەم قسەیەی کردووە، بەڵام ئەوەی کە گرنگە ئەوەیە، دەنگێك لە غەیب و پەنهانەوە دێت و ئەم کەسانە ئاڕاستە دەکات و دووریان دەخاتەوە لە نوورەکەی باوەڕداران کە ئەوان شایستەی نین، وە بەرەو دۆزەخ دەیاننێرێت.

خاڵێکی دیکە ئەوەیە کە ئەم خەڵەتێنراوانە، کاتێك پێیاندەوترێت ئەوە نوورێکە بچن بۆ لای، بە ڕاستیی ڕووناکییەکە دەبینن، بەڵام ئەو ڕووناکییە ڕووناکی ئاگری دۆزەخە..

بەمجۆرە دەبینین کە قورئانی پیرۆز کاریگەرییە بینراوەکانی بەکارهێناوە لەم دیمەنە غەیبی و پەنهانەدا.

جا جگە لەمەش، لە چەندین دیمەنی دیکەدا، پەروەردگار گرنگی داوە بە خستنەڕووی دیمەنە غەیبییەکان لە ڕێی بەکارهێنانی هەستەوەرەکان، بەتایبەتی هەستی بینین، دیقەتی ئەم ئایەتانە بدەن:

﴿ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذْ يَتَوَفَّى ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ﴾(الأنفال: ٥٠).

﴿ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلْمُجْرِمُونَ نَاكِسُوا۟ رُءُوسِهِمْ ﴾(السجدة: ١٢).

﴿ فَٱرْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِى ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٍ مُّبِينٍ ﴾ (الدخان: ١٠).

﴿ يَوۡمَ تَرَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ يَسۡعَىٰ نُورُهُم بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ ﴾ (الحديد: ١٢).

﴿ وَإِذَا رَأَيۡتَ ثَمَّ رَأَيۡتَ نَعِيمٗا وَمُلۡكٗا كَبِيرًا ٢٠ ﴾ (الإنسان: ٢٠).

﴿ وَتَرَىٰ كُلَّ أُمَّةٖ جَاثِيَةٗۚ ﴾ (الجاثية: ٢٨).

هەمووی بە "دەبینیت، ئەگەر بتبینیایە، سەیر کە، ئەگەر سەیر بکەیت...." دەستپێدەکات... جا پەنابردنە بەر ئەم هەستی بینینە بۆ ئەوەیە کە ئەو هەستە بجولێنرێت لای گوێگر ئەگەرچی لە خەیاڵدانیشیدا بێت تا وێنەیەکی ئەو باسە لای خۆی بکێشێت، ئەوکات کەسەکانی ناو وتووێژەکە لەبەردەمیدا دێنە قسە بەبێئەوەی پێویست بە باسکردنی "وتی ـ دەڵێت" بکات...

خاڵێکی دیکە بۆ بەرجەستەکردنی دیمەنە پەنهان و غەیبییەکان، بەکارهێنانی کردار و فرمان (فیعل)ـەکانە بە شێوەی رابردوو، کە دەلالەتە لەسەر دڵنیایی لە ڕوودانی ڕووداوەکانی ئایندە وەك بڵێی ڕویدابێت. ئەمە جگە لە بەکارهێنانی ئیسمی فاعیل و ئیسمی ئیشارە، کە بەهەمانشێوە بەرجەستەکردنی ڕووداوەکانە:

﴿ هَٰذِهِۦ جَهَنَّمُ ٱلَّتِي كُنتُمۡ تُوعَدُونَ ﴾ (يس: ٦٣)

﴿ هَٰذَا عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴾(الدخان: ١١)

﴿ ذَٰلِكَ يَوۡمُ ٱلۡوَعِيدِ ﴾(ق: ٢٠)

﴿ هَٰذِهِ ٱلنَّارُ ٱلَّتِي كُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ ﴾ (الطور: ١٤).

یان بەکارهێنانی فیعلی بکەر نادیار، یان هەر لابردنی وشەی "وتی - دەڵێت"، هەموو ئەمانە هاوکاریی ئەوە دەکەن کە دیمەنەکەی جیهانی پەنهان "غەیب" بخەنە بەرچاومان و بەرجەستە بن، هەر ئەمانەشە کە هێندە دیمەنەکە کاریگەر دەکەن کە گوێگر کاتێك دیمەنەکان دەخوێنێتەوە موچڕکە بە جەستەیدا دێت، وەك ئەوەی بەسەر "جوبەیری کوڕی موتعیم"دا هات کاتێك گوێی لە پێغەمبەر بوو (دروود ی خوای لێبێت) ئایەتی: ﴿ إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ لَوَاقِعٌ ۝٧ مَّا لَهُۥ مِن دَافِعٍ ﴾ی بەسەردا خوێندەوە، گیانی کەوتە لەرزین و مسوڵمان بوو.. یان "عوتبەی کوڕی ڕەبیعە" کاتێك سەروەرمان سەرەتای سوورەتی "فصلت"ی بۆ خوێندەوە، خۆی خست بە زەویدا لە کاریگەریی دیمەنەکان لەسەری.

یەکێکی دیکە لە هۆکارەکانی بەرجەستەکردنی دیمەنە پەنهانەکان، بریتییە لە وەسفکردنی دیمەنەکە، واتە: بەکارهێنانی تەکنیکی "وەسف"، جا با پێکەوە دیقەتی ئەم دیمەنە بدەین کە هەرگیز مرۆڤ تا ئێستا ئەم دیمەنە پەنهانەی نەبینیوە، بەڵام دیقەت بدەن چۆن لە چەند وشەیەکی کەمدا دیمەنەکە لەبەرچاوی گوێگردا بەرجەستە دەکات.

خوای گەورە دەفەرموێت: (﴿ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّٰلِمُونَ فِى غَمَرَٰتِ ٱلْمَوْتِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ بَاسِطُوٓا۟ أَيْدِيهِمْ أَخْرِجُوٓا۟ أَنفُسَكُمُ ﴾ (الأنعام: ٩٣) واتە: (خۆ ئەگەر ئەو ستەمکارانە ببینیت چۆن لە ئێش و ئازاری سەرەمەرگدان و فریشتەکانیش دەستیان کردووەتەوە: ئادەی گیانتان بدەن بە

دەستەوە و دەی ڕۆحتان دەرکەن). لەم ئایەتەدا ـ یان بەشێك لە ئایەتێك ـ هەموو ئەو ڕەگەزانەی تیایە کە یارمەتیدەرن بۆ زیندووکردنەوەی دیمەنێکی نەبینراو، کە پێشتر نەبووە، سەیری ئاڕاستەکردنی هەستەکان و داواکردنی کارپێکردنی بکە لە بڕگەی "ولو تری" "ئەگەر ببینیت"، کە چەندێك تەشویقی تێدا بەدی دەکرێت، پاشان وەسفێکی زۆر کورت بۆ ئەو ستەمکارانە دەبینین لە سێ وشەدا: "في غمرات الموت" "پەلەقاژەی سەرەمەرگ"، پاشان وەسفێکی زۆر کورتتری فریشتەکان ﴿بَاسِطُوٓاْ أَيۡدِيهِمۡ﴾ "دەستیان کردووەتەوە" تا ببینین چی دەکەن لە ستەمکاران لە ڕووی لێکۆڵینەوە لەگەڵیاندا بە سەرزەنشتکردن و گاڵتەپێکردنیان، هەروەها ئاماژەکردن بە سزادانیان لەڕێی "غمرات الموت" یان لەڕێی دەستکردنەوەی فریشتەکان لێیان.. بەمەش هەموو ڕەگەزەکانی دیمەنەکە بەرجەستە دەبن لەبەردەم گوێگردا و گوێگریش ئامادە دەبێت بۆ بیستنی قسەی فریشتەکان بەرانبەر بە ستەمکارەکان بەبێئەوەی پێویست بە هێنانی وشەی "وتیان ـ قالوا" بکات، بەڵکو ڕاستەوخۆ دیمەنەکە ئامادەکاری بۆ قسەکە دەکات بەبێ دەستوەردانی گێڕەڕەوە "راوی".. بەڵکو ئەگەر وشەکە باس بکرێت و دیمەنەکە وایلێبێت: فریشتەکان دەستیان کردووەتەوە و وتیان ڕۆحتان دەربکەن، ئەوا دەبێتە هۆی دوورخستنەوەی دیمەنەکە و گەورەترین هۆکاری وێناکردنی دیمەنەکە، لەکیس دەدرێت..

## دیمەنێکی ناوازە:

جا لە باسی وەسفدا، قورئان پلەی بالآی هەیە، دیقەت بدەن: وەسفی دۆزەخ دەکات بە هەموو وردەکارییەکانییەوە: ئاگرەکەی، گەرمییەکەی، پزیسکەکەی، هالآوەکەی، درەختەکەی، ڕووەکەکەی، خۆراکەکەی، خواردنەوەکەی، کاریگەرییەکەی لەسەر پێستی مرۆڤ و جەستە و دەروونیان...

هەروەها وەسفی بەهەشت دەکات بە هەموو وردەکارییەکانییەوە: سایە و سێبەری، دار و درەختی، گەلآ و گوڵی، میوە و خواردن و خواردنەوەی، ڕووبارەکانی، قەنەفە و کۆشك و تەلارەکانی، پشتی و سەرین و دانیشتووەکانی، خۆشی و خۆشگوزەرانییەکانی.

پاشان بە دوایدا وەسفێکی گەردوون و ناوازەییەکانی، لە کۆتاییشدا دیمەنێکی کۆتایی جوان و ناوازەی پەروەردگاری بەرز و بڵند کە لەسەر عەرشی باڵآ ئیستیوای کردووە، لە دەوری عەرشیش فریشتەکان کۆبوونەتەوە، دیمەنەکە گیان و دڵ و ڕۆحی گوێکر کەمەندکێش دەکات و لەگەڵ جیهانی مەلەکوتدا دەکەوێتە سوپاس و ستایشێك کە عەقڵ و ژیریی پەی پێنابات تەنها بەم وەسفە ناوازەیە نەبێت، دیقەت بفەرموون:

﴿ وَتَرَى ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ حَآفِّينَ مِنْ حَوْلِ ٱلْعَرْشِ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ ۖ وَقُضِىَ بَيْنَهُم بِٱلْحَقِّ وَقِيلَ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ (الزمر: ٧٥). واتە: (فریشتەکان دەبینیت دەوری عەرشیان داوە و سەرگەرمی تەسبیحات و سوپاس و

ستایشـی پـەروەردگارن، حـەق و دادوەریـی لـە نێـوان هەموانـدا جێبەجێکرا، وترا: سوپاس بۆ خوا، پەروەردگاری جیهانیان).

ئەم دیمەنە فرەجوان و ناوازە و پڕ لـە وەسـفە، تـەنها یـەك ڕسـتەی تێدا بەکارهاتووە کە قسـەکەرێکی نادیـار دەیڵێـت: (وتـرا: سـوپاس بـۆ خوا، پەروەردگاری جیهانیان)، کێ وتی؟ نازانرێـت، لەوانەیـە هـەر ئـەو کەسە بێت کە ڕاسپێردراوە بەئەنجامدانی ئەو جۆرە لێـدوان و کۆمێنتـە لە ناو دیمەنـە غەیبییەکانـدا، لەبەرئەوەیشـە فیعلەکـە بـە بکـەر نادیـار باسکراوە، کە پلەیەکە لە نێوان "باسکردن و لابردن"ی وشـەی "وتـی - دەڵێت: قال - یقول".

جگە لە لابردنی وشەی "قال - یقول"، هەنـدێکجار بابەتـە وتراوەکـە لابراوە، یان "بەشێك" لە بابەتە وتراوەکە لابراوە، سەیری ئـەم دیمەنـە بکـــە: ﴿ وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا يَٰمَعْشَرَ ٱلْجِنِّ قَدِ ٱسْتَكْثَرْتُم مِّنَ ٱلْإِنسِ ۖ وَقَالَ أَوْلِيَآؤُهُم مِّنَ ٱلْإِنسِ رَبَّنَا ٱسْتَمْتَعَ بَعْضُنَا بِبَعْضٍ وَبَلَغْنَآ أَجَلَنَا ٱلَّذِىٓ أَجَّلْتَ لَنَا ۚ قَالَ ٱلنَّارُ مَثْوَىٰكُمْ ﴾ (الأنعـام: ١٢٨) واتـە: (ڕۆژێـك دێـت خـوا هـەموویان کۆدەکاتەوە: ئەی دەستەی پەرییەکان، بەڕاستی ئێوە زۆر کەستان لـە ئینسانەکان گومڕا کرد. لەولاشەوە گوێلەمشـتەکانیان لـە خـەڵك دەڵێن پەروەردگارا هەنـدێکمان سـوودمان لـە هەنـدێکمان وەرگـرت، ئێسـتاش ئەوەتـە گەیشـتووینەتە ئـەو کـات و سـاتەی تـۆ بـۆت دیـاریکردووین، خـوایش فـەرمووی: ئـاگر، جێگەتانـە). جـا کاتێـك ورد دەبینـەوە لـەم دیمەنە، دەبینین وتەکـەی پـەروەردگار ئاڕاسـتەی "پەرییـەکان - جن"

کراوە، بەڵام وەڵامی دواتر لە لایەن "مـرۆڤ ـ ئینـس"ـەوە دراوەتـەوە، بەڵام وەڵامەکە بە "وَقالَ" دەستپێدەکات، دیقـەتی "واو"ەکـە پاشـان "قال" بدەن، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە بەشێك لە وتووێژەکـە لـە نێوان وتەکەی پەروەردگار و وەڵامەکەی مرۆڤ: ئینس لابراوە، بەڵام کام بـەش؟ جـا یـان بەشـێکە لـە وتەکـەی پـەروەردگار، یـان بەشـێکە لـە وەڵامەکـە، یـان بەشـێکە لـە وتووێژەکـە بـە تـەواوی کـە وتەیـەك و وەڵامێکی دیکـەی تێدا وتـراوە، چـونکە وتەکـە ئاڕاسـتەی پەرییـەکان کـراوە، ئایـا وەڵامەکـەیان کـوا؟ وەڵامەکـەش کـە باسـکراوە وەڵامـی مرۆڤەکانـە، ئـەی کـوا پرسـیارەکە کـە ئاڕاسـتەیان کـراوە؟ کەواتـە وتووێژەکـــە ئێمـــە وا تێدەگـــەین بەمشـــێوەیەیە: "ئـــەی دەســـتەی پەرییەکان، بەڕاستی ئێوە زۆر کەستان لە ئینسانەکان گومڕا کرد.

پەرییەکان وەڵامیان دایەوە و وتیـان: پـەروەردگارا! ئێمـە یارمـەتی ئینسانەکانمان دا و هەرچییەکیان دەویست بۆمان جـوان کـردن و ئێمـە زۆرمان لێنەکردن لە هیچ شتێك.

پاشـان پـەروەردگار فـەرمووی: ئـەی دەسـتەی مرۆڤـەکان، ئێـوە سـوودتان لـە پەرییـەکان وەرگـرت لەکاتێکـدا مـن هۆشـیارییم دابـوونێ لەوان، کە ئەوان دوژمنتانن.

لە وەڵامدا گوێلەمشتەکانیان لە خەڵك وتیان پەروەردگارا هەندێکمان سوودمان لە هەندێکمان وەرگرت، ئێستاش ئەوەتە گەیشـتووینەتە ئـەو کات و ساتەی تۆ بۆت دیاریکردووین. بەڵام بۆچی ئـەم حەزفـە کـراوە؟

لەبەرئـەوە كـراوە تـا دیمەنـەكان چـڕ بكرێنـەوە و بـاز بـدرێت بەسـەر ڕووداوەكاندا و ڕووداو بجوولێنرێت بۆ گەیشـتنە مەبەسـتەكەی، لەگـەڵ درككردن بە شتە لابراوەكە لە ڕێی ژیریی و عەقڵـەوە.. بـەوەش گـوێگر هەمیشە لە بارێكی هۆشیار و چاوكراوەدا دەمێنێتەوە و هیچی لەدەست دەرناچێت... یەكێكی دیكە لە تایبەتمەندییەكانی دیمەنـە غەیبییـەكان، بریتییە لە بەكارهێنانی شێوازی پرسیاركردن "ئوسلوبی ئیستیفهام" بۆ سەرزەنشتكردنی بێباوەڕان.. وەك ئەم نموونانە:

﴿أَكَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ﴾ (آل عمران: ١٠٦).

﴿أَلَمْ تَكُنْ ءَايَٰتِى تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ فَكُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ﴾(المؤمنون: ١٠٥).

﴿أَلَيْسَ هَٰذَا بِٱلْحَقِّ﴾(الأنعام: ٣٠)، (الأحقاف: ٣٤).

﴿أَوَلَمْ تَكُونُوٓا۟ أَقْسَمْتُم مِّن قَبْلُ مَا لَكُم مِّن زَوَالٍ﴾(ابراهیم: ٤٤).

﴿أَوَلَمْ نُعَمِّرْكُم مَّا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَن تَذَكَّرَ وَجَآءَكُمُ ٱلنَّذِيرُ﴾. (فاطر: ٣٧).

هەروەها چەندین ئایەتی دیكەش..

# کۆتایی

خوێنەری بەڕێز! لە کۆتایی ئەم کتێبەدا دەمەوێت دوو ڕاستیی گرنگ ئاماژە پێبکەم:

١- پاش خوێندنەوەی ئەم کتێبە و وردبوونەوە لە ناوازەیی چیرۆکە قورئانییەکان، بۆمان دەردەکەوێت چیرۆك لە قورئاندا بەسەرهاتی ئەفسانەیی نییە، هەواڵ و خەبەری میللەت و گەلانی پێشوو نییە، تەنها ئامۆژگاریی و پەند وەرگرتن نییە، بەڵکو لەگەڵ ئەوەدا کە باسی گەلانی پێشوو دەکات و پەند و ئامۆژگاریی لێوەردەگرین، هاوتەریب بەوە: چیرۆکە قورئانییەکان ڕەگەزێکی هونەریی ئەدەبین، کە هونەرێکی ئاسمانی کێشاویەتی و سەرقافڵەی ئەو هونەرانەی چیرۆکە کە ئێستا هەن، پەیوەندییەکی بەهێز هەیە لە نێوان بنیاتی شێواز (ئوسلوب) و بنیاتی هونەری و بنیاتی بابەتەوە لە چیرۆکە قورئانییەکاندا، کە هەمووی پێکەوە لە پێکهاتەیەکی بەهێزدا یەکدەگرن و دەبن بەیەك و چیرۆکێکی بنیاتبەهێزمان پێشکەش دەکەن، کە هەموو بەشەکانی بە یەکەوە بەستراون کە زیادەی تیادا نابینرێت و هیچیشی کەم نییە.. کەواتە دەتوانین ناوی بنێین: ئەدەب و وێژەی قورئان (الأدب القرآني)...

٢ـ سەبارەت بە ئامادەکردنی ئەم کتێبە، کە وەك لە پێشەکییەکەدا ئاماژەمان بۆ کرد، دووبارەی دەکەینەوە کە ئەم کتێبە زیاتر بیرۆکە سەرەکییەکە و نموونەکانی لە کتێبە عەرەبییەکە وەرگیراوە و بە وردیی و وشە بە وشە نەمانکردووە بە کوردی، ئەوەش لەبەر تایبەتمەندیی ئەو کتێبە کە زیاتر کتێبێکی ئەکادیمیی ئاستبەرزە و ئێمە زیاتر کارمان کردووە ناوازەیی چیرۆکە قورئانییەکان لە ڕێی ئەو نموونانەوە بخەینەڕوو کە باسمان کردووە..

لە کۆتاییدا دەڵێین: خوایە پاداشتی نووسەری کتێبەکە بدەرەوە بە چاکە و ئەم کارە بچووکەش لە ئێمە قبوڵ بفەرموو، لە ڕۆژی حەشر و لێپرسینەوەدا، من ئەم کتێبە لەگەڵ خۆم دێنم و دەڵێم پەروەردگارم! ئەمەم پێکرا بۆ خزمەتی قورئان و کتێبەکەت بیکەم، لێمەوەرگرە و قبوڵی بفەرموو....

**ئامادەکار**

**فەرەیدون ئەحمەد**

**مانگی چواری ٢٠١٧**



## سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی

سەنتەرێکی کوردستانی ناحکومی ناسیاسییە، گرنگیی دەدات بە توێژینەوە و تاوتوێکردنی پرسە هزرییە بنەڕەتییەکان بۆ دووبارە هێنانەگۆی دەق و تێکستە پیرۆزەکان و چۆنیەتی دابەزاندنی چەمکە مەعریفی و بەبایەخەکانی ئیسلام لە بوارە جیاوازەکانی سەردەمدا.

### ئامانجەکانی سەنتەر:

- بوژاندنەوەی بیرو هزر و بەکارخستنی مەعریفەی ئیسلامی لە ناوەندە زانکویی و پەروەردەییەکاندا، بە پشتبەستن بە بەهرە و توانا خودییەکانی ئەکادیمیانی کوردستان و جیهانی ئیسلامی و ئەزموونی بیرمەندانی مسولمان.
- پەرەپیدان و پەسەندکردنی روانگەی زانستی مەنهەجی لە چارەسەرکردنی کێشە و گرفتە هزرییەکاندا و بێلایەنبوون لە پرسە خیلافییەکاندا و خۆبەدوورگرتن لە بریاری پێشوەخت و شێوازی سۆزدارانە و هەوڵدان بۆ بابەتیبوون.
- کاراکردنی کەلەپووری دەولەمەندی ئیسلامی و سوودوەرگرتن لە سەرچاوە گرنگەکانی بیری ئیسلامی لە کۆن و نوێدا و سەرلەنوێ هێنانەگۆی چەمکە فیکرییە دوێنراوەکان لە مێژووی ئیسلامیدا، بە رەچاوکردنی گۆرانەکانی سەردەم.
- پەرەپێدانی چەمکی ئیعتیدال لە کایە فیکری و مەعریفییە جیاوازەکاندا و خۆبەدوورگرتن لە تیپەراندن و بەزایەدان.
- سەنتەر کاردەکات بۆ سەرلەنوێ و بەردەوام خوێندنەوەی هەردوو پەراوی قورئان و بوونەوەر بەپێی مەنهەج و میتودی زانستی و بەبێ چاولێکەری، بەڵکو بە نەفەسێکی تازە و بە سوودوەرگرتن لە عەقڵی راشکاو و نەقڵی سەلمێنراو.

**ئەم کتێبە:**

گوزەرێکە بەناو وردەکاریی چیرۆکە قورئانییەکاندا، تیایدا خوێنەر بە وردەکاریی و گرنگیی دەستەواژە و وشە و تەنانەت بوونی پیتێک لە شوێنێکدا و نەبوونی لە شوێنێکی دیکەدا ئاشنا دەکات. تیایدا باس لە هۆکاری دووبارەبوونەوەی چیرۆک دەکات لە قورئاندا، تیشک دەخاتە سەر هەڵبژاردنی دیمەنێک لە چیرۆکێکدا و باسکردنی لە سورەتێکی دیاریکراودا، هۆکاری ئەوەی بۆچی لە هەندێک شوێندا چیرۆکێک بە پوختی باسکراوە و لە شوێنێکی دیکەدا بە درێژیی دەخاتەڕوو. ئەی ڕۆڵی "بازدان" چییە بەسەر کات و شوێندا لە دیمەنەکانی چیرۆکدا؟. ئەی چ وردەکاریی و نهێنییەک هەیە لەناو دیمەنی حیوار و گفتوگۆی ڕووداوەکانی پاش زیندووبوونەوە و بەهەشت و دۆزەخدا؟

بۆچی هەندێک جار لەناو گێڕانەوەکاندا وشەی (قال) هاتووە، ئەی بۆ جاری دیکە نەهاتووە؟، یان بۆچی دووجار هاتووە؟ ئەی بۆ هەندێکجار بکەری (قال) دیار نییە؟ ئەی ئەوە کێیە کە ڕاسپێردراوە بە وتنی گوزارشتی کۆتایی دیمەنی ڕووداوەکانی پاش زیندووبوونەوە لەناو چیرۆکە قورئانییەکاندا، کە بە شێوازی (قیل ـ وترا)، دیمەنەکە بەپایان گەیشتووە؟

لە کۆتاییشدا ئەوە بە خوێنەر دەڵێت: خودای گەورە سەرجەم ئەم چیرۆکانەی بۆ سەرووەری مرۆڤایەتی و پاشان بۆ "من" و "تۆ"، گێڕاوەتەوە..

